# بنچینەکانی الاسماء والصفات

شیکردنەوەی: مامۆستا إسماعیل سوسەی

ئامادەکردنی: أبو یحی الکردي

ساڵی: ٤/ذوالقعدة/١٤٤١

# بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

# ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: بنچینەکانی الاسماء والصفات

شیکردنەوەی: مامۆستا اسماعیل سوسەیي

ئامادەکردنی: أبو يحى الكردي

ژمارەی پەڕە: ١٢٣

ساڵی: ٤/ ذو القعدة/ ١٤٤١ی کۆچی

# بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

{إنَّ الْحَمْدَ لِلهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ ، وَنَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا ، مَنْ يَهْدِهِ اللّٰهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِىَ لَهُ ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيهِ وَسَلَّم وَعَلَى آلِهِ وَصَحبِهِ وَمَن تَبِعَهُم بِإحسَانٍ إلَى يَومِ الدِّين وَسَلِّم تَسليِماً كَثِيراً. }

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ }

{ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا، زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا } ، { يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ

وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيدًا * يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ

اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا }

أمابعد...

# پێشەکی

بڕواهێنان بە ( اللّٰه )ی بەرز و مەزن و ناسینی تەواوی بە ناوە زۆر جوانەكانی و سیفەتە تەواو بەرزەكانی و پەیڕەوكردنی فەرمان و دووركەوتنەوە لە قەدەغەكانی بەختەوەری دونیا و سەرفرازی دوارۆژە ، لە سەردەمی هاتنی ئیسلام و بانگەوازی پێغەمبەری اللّٰه ( صلى اللّٰه عليه وسلم ) تا تەواوبوونی سەردەم و سەدەی هاوەڵان و صەحابیەكانی ( اللّٰه لێیان ڕازی بێت ) هیچ تێگەیشتنی هەڵە و نادرووست دەربارەی دەقەكانی قورئانی پیرۆز و فەرموودەكانی پێغەمبەری دڵسۆز ( ﷺ ) نەبووە و تەواو وەكو ( اللّٰه ) ویستوویەتی تێگەیشتوونە و ملیان نواندووە و پەیڕەویان كردووە ، بەڵام لە سەردەمی شوێن كەوتووان ( التابعين ) ـ ڕەحمەتی اللّٰه یان لێ بێت.

هەندێک جیاوازی و بۆچوون و تێگەیشتنی هەڵە و نادرووست دەربارەی هەندێک لە دەقەکان و باس و بابەتە بیرو بڕوایەکان سەریان هەڵدا و هێدی هێدی تاکو بە تێپەڕبوونی کات بوونە چەندین تاقم و کۆمەڵی لادەر لە پێشین و هاوەڵان و خۆیان گومڕابوون و خەڵکیشیان گومڕاکرد ، لەوانە : {( الجهمية ) و ( المعتزلة ) و ( القدرية )و ( المرجئة ) و ( الخوارج ) و ( الأشعرية ) و ( الماتريدية ) و هتد.....[١]

کە لە بـاس و بـابەتی ( الإیمـان ) پێناسـەکەی و ( مسـمی الإیمـان ) نـاوە زۆر جـوان و سـیفەتە بەرز و تەواوەکـانی ( الله ) و ژیـانی بەرزەخ و دوارۆژ و بەهەشـت و دۆزەخ و فەرمـانڕەوایەتی ئیمانـداران و هتـد.... ،هەنـدێکیان کەمـتەرخەمی ( تقصـیر )ـیان کـردووە و هەنـدەکەی تـریش زێـدەڕەوی و (غلـو)ـیان کـردووە

(١): لە کۆتاییدا بەکورتی پێناسەیان دەکەین إن شاء الله

تەنیا ئەهلی سوننە و جەماعە لە نێوانیاندا نێوەندگیر بوونە و ماینەوە لەسەر دەستگرتن بە قورئان و فەرموودە و بە تێگەیشتنی پێشینی چاک ( السلف الصالح ) و پەیڕەوکردنی ڕێبازی ئەوان ، لە هەموو سەردەمەکانیش ( الله )ی پەروەردگار هەندێک کەڵە زانای دیاری ئەهلی تەحقیق و لێکۆڵەرەوەی بە توانای هیدایەت داوە بۆ پاراستن بە بەڵگەی قورئان و فەرموودە و گەر پێویستی کردبێ عەقڵی و ژیریش ڕێبازی ئەهلی سوننە و جەماعەی وەکو شیخ الإسلام ابن تیمیة و ابن القیم و شاگرد و شوێنکەوتووانیان تاکو بە ئێستای ئێمە گەیشتووە.

وە هەزاران جار (الحمدلله رب العالمین) کە (الله)ی پەروەردگار هیدایەتی بەندەیەکی وەك منی لاوازیشی داوە لەو سەردەمەی کە ڕێچکە و ڕێگاکانی گومڕایی و فیتنە هەموو لایەکی گرتیتەوە و تەنیتەوە لە ڕێبازی ڕاست و دروستی پێشینان و ئەهلی سوننە و جەماعە بگەین

كە تاكە ڕێباز و ڕێگایەك لە ڕووی ڕەوایەتی و سەلامەتی لە بیرو بۆچوون دەربارەی (اللّٰه) بە یەكگرتن (توحید اللّٰه) ناوە زۆر جوان و سیفەتە بەرز و تەواوەكانی...

لەم ڕۆژگارەدا كە هەستم كرد زۆرێك لە خەڵكی بە گشتی تەنانەت ئەوانەی شوێنكەوتەی ڕێبازی ئەهلی سوننە و جەماعەشن لە بە تەمەن و گەنجەكان بەهرەمەندی تەواو نینە لە زانست و زانیاری تەواو دەربارەی خواناسی بە ناوە زۆر جوان و سیفەتە تەواوەكانیەوە هەڵسام بە خواستنی یارمەتی و سەركەوتن لە (اللّٰه)ی مەزن بۆ وتنەوەی چەند وانەیەك دەربارەی بنچینەكانی ناوە زۆر جوان و سیفەتە بەرزەكانی (اللّٰه)ی بەرز و مەزن لە دیدگای قورئان و فەرموودە بە تێگەیشتنی پێشینانی چاك (السلف الصالح) و

شيكردنەوەی زانايانی متمانەی برِواپێكراوانی ئەهلی سوننە و جەماعەی, ئەوەيندەی كە الله لە عيلمی خۆی بەهرەوەری كردوين لە هەژدە بنچينەيدا, كە حەوتيان بۆ بەڵگەكانيان و ناوە زۆر جوانەكانی و حەوتيشيان بۆ سيفەتە بەرز و تەواوەكانی (الله) و چواريش بۆ بەڵگەكانيان تۆمارم كردووە و بەكورتی ڕوونيانم كردۆتەوە و بەڵگەی ئايەتی و قورِئان و فەرموودە و هەندێك جار ژيريشم بۆيان هێناوەتەوە...

جا ئەوەی بەيانی دەكەين ئەگەر دەقاودەق ئەوەیناميلكەی (القواعد المثلى في صفات الله وأسمائه الحسنىٰ)؛ دانراوی: محمد بن صالح العثيمين'يش نەبێت بەڵام زۆربەی هەرە زۆری لە دەربرِين و ڕێزبەنديكردنی ئەوەوەيە, لەگەڵ ئەوەی پاشخانە زانستيەكەی چەند ساڵەی ڕێگای بەدەستهێنانی زانستيم سوود و بەهرە وەرگرتنم لە

پەرتووکەکانی شێخ الاسلام ابن تیمیة و زانایانیتری ئەهلی سوننە و جەماعەی...

لە (اللە) مەزن و بەرز دەپاڕێمەوە (ئیخلاص و صواب)ی پێ بەخشیبم و بیکاتە توێشووی دواڕۆژم و مایەی ڕزگاربوونم لە ئازار و ناخۆشی ناو گۆڕ و دواڕۆژم و سوود بگەیەنێتە بڕواداران بە گشتی و بانگخواز و خوازیارانی زانستی شەرعی بە تایبەتی...

داوای لێبوردنیشم هەیە لە کەم و کورتی و چونکە ویستومانە پوختی بکەینەوە بە ویستی اللەی مەزن.

ئەوەی ڕاست و دروست و پێکانە لە منەت و فەزڵی (اللە)ی بەخشندەی میهرەبانە و ئەوەی هەڵە و کەم و کورتیشە لە (إبلیس) و منی بەندەی خاوەن کەم و کورتییە... (اللە) لێم ببورێ و بم بەخشێ.

# بنچینەكانی ناوە زۆر جوان و سیفەتە تەواوەكانی (اللّٰه) و بەڵگەكانیان

(١٨) هەژدە بنچینە بۆ ناوە زۆر جوان و سیفەتە بەرز و تەواوەكانی (اللّٰه) و بەڵگەكانیان لە لایەن ئەهلی سوننە و جەماعەوە دانراوە:

(٧)- حەوت بنچینە هی ناوە زۆر جوانەكانە.

(٧)- حەوت بنچینە هی سیفەتە بەرز و تەواوەكانە.

(٤)- چوار بنچینە هی بەڵگەكانیانە.

# حەوت بنچینەی ناوە زۆر جوانەکانی (اللّٰه)

## بنچینەی یەکەم:

ناوە زۆر جوانەکانی (اللّٰه)ی هەموویان زۆر جوانن و لەوپەڕی جوانین

(أسماء الله كلها حسنیٰ)

(اللّٰه)ی بەرز و مەزن فەرموویەتی: ﴿وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ﴾ **الأعراف:**

**١٨٠**

واتە (اللّٰه) خاوەنی ناوە زۆر جوانەکانیەتی ، بۆ (اللّٰه)یە ناوە زۆر

جوانەکان.

نموونە:

**(الحَيْ)** زيندوويەکی تەواو: ناوێکی زۆر جوانی (اللە)یە, سیفەتی (الحیاة= زیندوویەتی و ژیان)ی لەخۆگرتووە, بەڵگەیە لەسەر ژیانێکی تەواوی بێ کەم و کورتی کە نەبوونی لە پێش نەبووبێ نەمانیشی بەدواوە نەبێت, سیفەتە تەواوەکانی (العلم, القدرة, السمع, البصر) واتە (زانست و توانا و بیستن و بینین) و جگە لەوانەش دەخوازێ و پێویست دەکات:

جوانیەکە بە دوو ڕەچاوکردنەوەیە:

١- تاك و تەنیا ناوێك: هەر یەکێك لە ناوە زۆر جوانەکانی (اللە) وەکو تاك زۆر جوان و تەواوە،

بۆ نموونە:

(**العزيز**) بەتوانای زاڵ

(**الحكيم**) دانای كاربەجێ

٢- ناوێك لە پاڵ ناوێكی تر: هاتنی ناوێك لە ناوە زۆر جوانەكانی لە پاڵ ناوێكیتری زۆر جوان و تەواو, جوانی و تەواویەكەی زۆر و زیاد دەكات, وەكو: (العزيز الحكيم)

(**العزيز**) وەكو تاك و تەنیایی مانای زۆر جوانی تەواو دەبەخشێت, (**الحكيم**)یش بە هەمان شێوە, كە دەچنە پاڵ یەكتر و لەگەڵ یەكتر دێن و دوو زۆر جوانی تەواو كۆدەبنەوە و جوانیەكانیان و تەواویەكانیان زۆر زۆر زیاد دەكات... وەكو ئەوەی دوو ڕووناكی كە هەر یەكە ڕووناكی و جوانیەكەیان زۆر زیاد دەبێت و دەدرەوشێتەوە.

الله فەرموویەتی:

﴿وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ **البقرة: ٢٤٠**

واتە: (الله) زاڵی بەتوانای دانای كاربەجێیە.

﴿لَا إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾

**آل عمران: ٦ , ١٨**

واتە: هیچ پەرستراوێكی ڕەوا نییە جگە لەو (الله)یەی زاڵی بەتوانای دانای كاربەجێیە.

﴿مِنْ عِندِ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ﴾

**آل عمران: ١٢٦**

واتە: لە لای (الله)ی زاڵی بەتوانای دانای كاربەجێیە.

﴿إِنَّ اللّهَ كَانَ عَزِيزاً حَكِيماً﴾

**النساء: ٥٦**

واته: بەڕاستی (اللّٰه) زاڵی بەتوانای دانای کاربەجێیە....

## بنچینەی دووەم:

ناوە زۆر جوانەکانی (اللە)ی بەرز و مەزن, **عەلەم و وەسفن**:

**(أسماء الله الحسنىٰ أعلامٌ وأوصافٌ)**

بەڵگەبوونیان لەسەر زاتی (اللە):

(**علم**) ناو و ناونیشانن بۆی و (پێیانەوە دەناسرێنەوە), بەڵگەبوونیشیان لەسەر (إسم=ناو) واتا و ماناکانیان وەسفن بۆی.

بەڕەچاوکردنی (علم)یەتیان هەموو ناوەکان ناو و بەڵگەن بۆ یەك زات کە ئەویش (اللە)یە

بەڕەچاوکردنی (**وصف**)یەتیان لە یەك جیاوازن هەر ناوێکیان مانا و واتای تایبەتی جیاواز لە مانا و واتای ئەویتری هەیە.

بۆ نموونە:

**(الخالِق)** بەدیهێنەر, **(العليم)**: زانا, **(السميع)**: بیسەر, **(البصير)**: بینەر, **(الغفور)**: لێبوردن و بەخشین, **(الرحيم)**: ڕەحمەت و بەزەیی..

هەموو ئەو ناوانە بەڵگە و ناون بۆ زاتی (اللّٰه) و هەریەکەشیان مانا و واتای تایبەتی خۆیان هەیە جیاواز لە مانای ئەوەیتر.

(اللّٰه) فەرموویەتی: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ **البقرة: ٢٤٤**

واتە: بزانن بەڕاستی (اللّٰه) بیسەری زانایە.

﴿إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ **آل عمران: ٣٥**

واتە: بەڕاستی تۆ و هەر تۆی (اللّٰه)ی مەزن بیسەر و زانا.

﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾ **النساء: ٥٨**

واتە: بەڕاستی (اللّٰه) بیسەری بینەرە.

﴿وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ **آل عمران: ٣١, ١٢٩، النساء: ٢٥**

واتە: (اللّٰه) لێبوردە و بەخشەر و بەزەیی گەیەنەرە.

﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ **النساء: ٢٣**

واتە: بەڕاستی (اللّٰه) لێبوردەی بەزەیی گەیەنەرە.

﴿وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ **النساء: ٩٦, ١٠٠**

واتە: (اللّٰه) لێبوردەی بەزەیی گەیەنەرە.

﴿يَجِدِ اللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ **النساء: ١١٠**

واتە: (اللّٰه)ی دەبینیەوە لێبوردەی بەزەیی گەیەنەرە.

﴿وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ **يونس: ١٠٧**

واتە: ئەو (اللّٰه)یە لێبوردە و بەزەیی گەیەنەرە.

## بنچینەی سێیـەم:

ناوە زۆر جوانەکانی {اللّه}ی بەرز ئەگەر بەڵگە بێت لەسەر ئاوەڵناو (**وصف**)ی تێپەڕ (**متعد**)ی سێ شت لەخۆ دەگرێت.

١- جێگیرکردنی ناوەکە.

٢- جێگیرکردنی ئەو سیفەتەی کە ناوەکە لە خۆی گرتووە.

٣- جێگیرکردنی ئەوەی ناوەکە دەیخوازێ و شوێنەوار و بڕیارەکەشی.

ئەگەر ناوەکە بەڵگەش بێت لەسەر ئاوەڵناو (**وصف**)ی تێنەپەڕ (**غیر متعدّ**) دوو شت لەخۆوە دەگرێت:

١- جێگیرکردنی ناوەکە

٢- جێگیرکردنی سیفەتەکەی لەخۆیەوە دەگرێت

**(أسماء الله الحسنىٰ إنْ دلَّت علىٰ وصَفٍ متعدٍّ تضمنت ثلاثة أمور)**:

١- ثبوت الإسم.

٢- ثبوت الصِفة التي تضمنها الإسم.

٣- ثبوت مقتضاها وحكمها وأثرها.

**(وإن دَلَّت علىٰ وَصفٍ غير متعَدٍّ تتضَمَّنُ أمرين)**:

١- ثبوت الإسم.

٢- ثبوت الصِّفة التي تضَمَّنَها.

نموونەی ئەو ناوەی بەڵگەیە لەسەر سیفەتی تێپەڕ (**متعدّ**)ی:

(**السميع**): بیسەر, بەڵگەیە لەسەر سیفەتی بیستن کە تێپەڕ (**متعدّ**)یە, ئەوەی دەخوازێ کە چرپە و نهێنی دەبیستێ...

(اللە) فەرموويەتى:﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا ۚ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾

**المجادلة: ١**

واتە: بێگومان (اللە) بيستى قسەى ئەو ئافرەتەى (خولة بنت ثعلبة) االلەى لىٚ ڕازى بێت كە گفتوگۆى لەگەڵت دەكرد (ئەى مُحَمَّد ﷺ) دەربارەى هاوژينەكەى (أَوْس)ى كوڕى (الصامِت) خواى لىٚ ڕازى بێت سكاڵاكردنەكەى بۆ لاى (اللە), (اللە) گفتوگۆيەكانتان دەبيستێ بەڕاستى (اللە) بيسەرى بينەرە.

ئەو ئايەتەى ناوى (سميع) بۆ (اللە)ى هاتووە كە سيفەتى (**السَمع**)ى لەخۆ گرتووە, بيستنى چرپە و دەنگ نزمى و هێدى قسەكردنى نێوان (خولة) خوا لێى ڕازى بێت و پێغەمبەرى خواى (ﷺ) دەخوازێ و جێگيرى كردووە.

كه (عائشة) خوا لێی ڕازی بێت گوتویەتی: (الحمدلله الذي وَسِعَ سمعه الأصوات, لقد جاءت المجادلة إلى النبي ﷺ تكلمه وأنا في ناحية البيت, ما أسمع ما تقول, فأنزل الله عز وجل: (قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا...) **المجادلة: ١**

واته: هەموو سوپاس و ستایشەکان بۆ ئەو (الله)ی شایسته که بیستنەکەی فراوانە بۆ دەنگەکان, بەڕاستی و بێگومان گفتوگۆکارەکە {مەبەستی (خولة)یه} هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی بۆ دەکرد و منیش لە لایەکی ماڵەکەی بووم, نەمدەبیست ئەوەی دەیگووت (مەبەستی ئەوەیە کە لە ژوورێکی بچووك ئەوەندە لێیانەوە نزیك بووە بەڵام دیارە (خولة) بەهێدی و بە دەنگی بچووك و نزمەوە گوفتاری

كردووه نەيبيستووه و تێنەگەيشتيه چی وتيه كەچی (اللّٰه)ی بەرز و مەزن بيستيەتی و ئايەتی دابەزاندووه) (اللّٰه)ی بەرز و مەزن دايبەزاند:

﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا...﴾ **المجادلة: ١** [(١)]

نموونەی ئەو ناوەش كە بەڵگەيە لەسەر سيفەتی تێنەپەڕ (**غير متعدّ**):

(**الحي**) ناوێكی زۆر جوانی (اللّٰه)يە و سيفەتی زيندوويەتی و ژيانی تەواوی بۆ (اللّٰه)ی لەخۆوەگرتووه, جا تەنيا ناوەكە (الحيّ) پێويستە جێگير بكرێ بۆ (اللّٰه) و سيفەتی زيندوويەتی و ژيان (الحياة)ی بێ سەرەتا و كۆتا و بەردەواميشی بۆ جێگير بكرێت.

(اللّٰه) فەرموويەتی: ﴿اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ ۚ...﴾ **البقرة: ٢٥**

---

(١):مسند أحمد: (٦/ ٤٦) وقال ابن كثير: وهكذا رواه البخاري في كتاب التوحيد تعليقاً: (فتح الباري: ١٣/ ٣٨٤). المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير،

ص:١٤٢١

واتە: اللّٰه كە هيچ پەرستراوێكى ڕەوا نييە جگە لەو, زيندووى ڕاگرە.

## بنچینەی چوارەم:

بەڵگەبوونی ناوە زۆر جوانەکان لەسەر زات و سیفەتەکانی (اللّٰه)ی بە

(**مطابقة**) براوبڕ, (**تضمن**) گرتنەخۆ, (**الإلتزام**) پێویستکار, دەبێت:

**(دلالة أسماء الحسنىٰ علىٰ ذات وصفات اللّٰه تعالىٰ تكون بـ (المطابقة), وبـ (التضمن), وبـ(الإلتزام)**.

ڕوونکردنەوەی (**دلالة المطابقة=براوبڕ**) و (**دلالة التضمن=گرتنەخۆ**) و (**دلالة الإلتزام=پێویستکار**):

١-(**دلالة المطابقة**) بەڵگەبوونی براوبڕ: [١]

بەڵگەبوونی بێژەیە (دلالة اللفظ)ە لەسەر تەواوی ئەو مانایەی بۆی دانراوە.

---

(١):(المطابقة): براوبڕ , بڕ بە بڕ , هاودەق , وەك یەكبوونی.

بۆ نموونە: (**الخالق**) بەدیهێنەر ، بەو زاتە دەگوترێ کە بەدیهێنراوەکانی لە نەبوونەوە کە وێنەیان نەبووە هێناوەتیە بوون و دەیانهێنێتە بوون.

جا بەڵگایەتی براوبڕ (دلالة المطابقة) (الخالق) بەڵگەیە لەسەر زاتی (اللّٰه) و هەم لەسەر سیفەتی بەدیهێنان (الخالق) بەیەکەوە و بەیەکجار.

٢-(**دلالة التضمن**) بەڵگەبوونی گرتنەخۆ: [١]

بەڵگەبوونی بێژەیە (**دلالة اللفظ**)ە لەسەر بەشێکی ئەو مانایەی بۆی دانراوە.

بەڵگەبوونی لەسەر زاتی (اللّٰه) بە تەنیا و سیفەتی بەدیهێنانیش (صفة الخلق) بە تەنیا, بەڵگەیەتی گرتنەخۆ (دلالة التضمن)ە.

(١):(التضمن): گرتنەخۆ , لەخۆوەگرتن , لەناوبوون , تیابوون , تیایەتی.

٣-(**دلالة الإلتزام**) بەڵگەبوونی پێویستکار: [١]

بەڵگەبوونی بێژەیە (**دلالة اللفظ**)ە لەسەر شتێکی بەدیهێنەر بە بەڵگەبوونی پێویستکار (**دلالة الإلتزام**) ئەوەی دەخوازێ و پێویست دەکات کە (**الخالق**) بەدیهێنەر زانا و شارەزا و توانادار بێت,

واتە: (عالم) بێت خاوەنی (علم) بێت بەوەی کە بەدیدێنێت و (قادر) بەتوانا بێت و (قدرة)ی بەدیهێنانەکەی هەبێت.

(الله) فەرموویەتی: ﴿اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ﴾ **الزمر: ٦٢**

واتە: (الله) بەدیهێنەری هەموو شتێکە، وە فەرموویەتی:

﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَمِنَ الْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ الْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا﴾

**الطلاق: ١٢**

---

(١):(الإلتزام): پێویستکار , پەیوەستکار , ناچارکاری.

واتە: ئەو (اللە)يەی حەوت ئاسمانەكانی بەدیهێناوە و لە زەویش بە نموونەی ئەوان و فەرمان لە نێوانیاندا دادەبەزێنێ تاكو بزانن بەڕاستی (اللە) لەسەر هەموو شتێك بەتوانایە و بەڕاستی (اللە) زانستی بە هەموو شتێك دەوریدایە.

## بنچينـەى پێنجەم:

ناوە زۆر جوانەكانى (اللّٰه)ى بەرز وەستاوە و, بۆ (عقل) مەوداى نييە.

**(أسماء اللّٰه الحسنىٰ توقيفية لا مجال للعقل فيها)**

پێويستە لە ئاستى ئەو ناوە زۆر جوانانەى (اللّٰه) كە لە قورئان و فەرموودە هاتوون بوەستين و بۆيان زياد و كەم نەكەين و (عەقڵ)يان تێدا بەكارنەهێنين, نابێ بە گوێرەى عەقڵ لێيان كەم يا زياد بكەين, چونكە (عقل) لەوەى كەمترە كە بتوانێ پەى ببا و (دركى) ئەوەى شايستەيە بۆ (اللّٰه)ى بەرز و مەزن لە ناوەكان و سيفەتەكان بكات.

(اللّٰه) فەرموويەتى: ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ ۚ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَـٰئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولًا﴾ **الإسراء: ٣٦**

واتە:بەدوای شتێك مەچوو و لێی مەدوێ كە زانستت پێیەوە نییە, بەڕاستی بیستن و بینین و دڵ و بیركردنەوە هەر هەموو ئەوانە دەربارەی و لێیەوە بەرپرسیارە.

## بنچینەی شەشەم:

ناوە زۆر جوانەکانی ( اللّٰه ) کورت هەڵنەهاتووە لە ژمارەیەکی دیاریکراو.

**(أسماء الله الحسنى غير محصورة بعدد معين)**

بە گوێرەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ژمارەی ناوە زۆر جوانەکانی ( اللّٰه ) دیاری نەکراوە و سنووردار نییە ، جا درووست نییە و نابێ هەر لەخۆمانەوە ژمارەیەکی بۆ دابنێن و بڕیار بدەین.

اللّٰه فەرموویەتی ( وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ ۚ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَـٰئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولًا ) **الإسراء : 36**

واتە : بەدوای شتێک مەچوو و لێی مەدوێ كە زانستت پێیەوە نییە ، بەڕاستی بیستن و بینین و دڵ و بیرکردنەوە هەر هەموو ئەمانە لێیەوە بەرپرسیارە.

جا درووست نییە و نابێ هەر لەخۆمانەوە ژمارەیەکی بۆ دابنێین و بڕیار بدەین.

مەبەست لەو ئایەتە ئەوەیە نابێ مرۆڤ لەخۆیەوە بەبێ زانست و زانیاری لە هیچ شتێک بدوێت و قسەبکات بە تایبەتی لە باس و بابەتە شەرعی و ئاینییەکان لەنێویشیان بە تایبەتی تر بابەتە نادیار و پەنهانەکان و ئەوانەشی کە دەربارەی زات و سیفەت و کردارەکانی ( الله ) یە ، چونکە لێپرسینەوەی تەواوی لێ دەکرێت لە ڕۆژی دواییدا لەسەری،.

پێغەمبەریش ( ﷺ ) فەرموویەتی : **( أسألُك بكلِّ اسمٍ هو لك سميتَ به نفسَك أو أنزلتَه في كتابِك أو علمته أحدًا من خلقِك أو استأثرت به في علمِ الغيبِ عندك )**[١]

واتە : ( ئەی اللّٰه داوات لێدەکەم بە هەر ناوێکی تۆ هەتە کە خۆتت پێناو ناوە ، یان لە پەرتووکەکەت داتبەزاندووە ، یان کەسێک لە بەدیهێنراوانت فێرکردووە ، یان لەلای خۆت لە زانستی نادیار و پەنهان هێشتیتەوە ) .

کەواتە بەو فەرموودەیە تەواو بەدیارکەوت کە ( اللّٰه ) هەندێک لەناوە زۆر جوانەکانی لەلای خۆی هێشتیتەوە و بۆ بەندەکانی ڕەوان نەکردووە ، هیچ کەس و بەندەیەک زانستی بە خودی ناوەکان و

(١):مسند أحمد : 391/1

ژمارەیانەوە نییە تاکو بتوانێ لە ژمارەیەکی دیاریکراو سنووردایان بکات و ژمارەیان کورت هەڵبێنێت .

ئەو فەرموودەیەش کە پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرموویەتی : ( الله ) نەوەت و نۆ ناوی هەیە مانای ئەوە ناگەیەنێت کە ( الله ) تەنها ئەو نەوەتو نۆ ناوەی هەبووە و هەیەتی ، بەڵکو مانای تەواوی فەرموودەکە ئەوەیە هەریەکێک ئەو ژمارە ناوەی ( الله ) فێرببێت و لێیان تێبگات و لەبەریان بکات و کاریگەریان لەسەری هەبێت و پەیڕەویان لێ بکات دەچێتە بەهەشتەوە ، ئەوەش دەقی فەرموودەکەیە :

**( إن لله تسعة وتسعين اسمًا من أحصاها دخل الجنة )**(١)

واتە : بۆ ( الله ) نەوەتو نۆ ناو هەیە ، سەد یەک کەم ، ئەوەی بیانژمێرێ دەچێتە بەهەشت.

---

(١):[ البخاري : 2736 - ومسلم : 2677 ]

## بنچینەی حەوتەم :

دووركەوتنەوە و وازهێنان لە ( إلحاد ) لادان و گۆڕینی مانا و بەڵگەبوونی ناوە زۆر جوانەكانی ( الله ) چەند جۆرێكە :

**( اجتناب وترك الإلحاد الذي هو الميل والتغيير عما يجب من المعان والدلالة في أسماء الله الحسنى ، وهو أنواع ) :**

جۆرەكانی لادان و گۆڕین ( **الإلحاد** ) :

١- گۆڕینی بەشێك لە ناوەكان یان لەوەی كە ناوەكە لەسەری بەڵگەیە لە سیفەتەكانی ( الله ) یان شوێنەوار و بڕیارەكانی ، وەكو پەكخەران ( المعطلة ) جەهەمیەكان و جگە لەوانیش كە سیفەتەكانی ( علم ) و ( قدرة ) زانست و توانا ... هتد ، پەكخستووە و بڕیاریان

نەداوە بۆ (اللّٰه) كە لە ناوە زۆر جوانەكانى: (العليم , القدير) وەردەگيرێت.

٢- ناوەكان دەكەنە بەڵگە لەسەر سيفەتانێكى وێچوو بە سيفەتەكانى بەديهێنراوان ، وەكو وێچووێنەر (المشبهة) و هاووێنە بڕياردەران (الممثلة) كە وايان كردووە و دەيكەن كە (علم) و (سيفەتەكانى ترى (اللّٰه)) بە هى بەديهێنراوان (مخلوق)ەكانيان چواندووە و دەيچووێنن.

٣- ناونانى (اللّٰه) بە ناوێك كە ناوى خۆى پێيەوە نەناوە و نەهێناوە, وەكو نەسڕانييەكان بە (اللّٰه)يان گوتووە (إلٰه الأب) خواى باوك, فەيلەسوفەكان بە (العلة الفاعلة) هۆكارى بكەرى كاريگەر ناويان بردووە.

٤- وەرگرتن و داتاشينى ناوى بت و پەرستراوەكان لە ناوە زۆر جوانەكانى (اللّٰه), وەكو نەسڕانييەكان و هاوبەش بڕياردەران

(المشركون) ناوى بت و پەرستراوەكەيان (العزىٰ)يان لە (العزيز)ى داتاشيبوو و وەريانگرتبوو, (اللات)يشيان لەسەر يەكێك لە وتە و بۆچوونەكان لە (الإلٰه) خوا و پەرستراويەوە وەرگرتبوو.

**حوكمى لادان و گۆڕين (الإلحاد)ى لە ناوە زۆر جوانەكانى (اللّٰه)ى بەرز و مەزن:**

لايەنە كەميەكەى حەڕام و قەدەغەيە و خاوەنەكەى گوناهبار دەبێت و جاريش وايە دەبێتە هاوبەشى (شرك) و (كوفر) بەگوێرەى بەڵگەى شەرعى:

(اللّٰه) فەرموويەتى: ﴿وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ فَادْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ **الأعراف: ١٨٠**

واتە:بۆ (اللە)يە ناوە زۆر جوانەكان و پێیانەوە لە بەری بپاڕێرەوە, وازبێنن و لێیان بگەڕێن ئەوانەی لادەدەن و دەگۆڕن لە ناوە زۆر جوانەكانی (اللە) بەوەی دەیكەن سزادەدرێن.

# حەوت بنچینەی سیفەتە بەرز و تەواوەکانی (اللّٰه)

## بنچینەی یەکەم:

سیفەتە بەرز و تەواوەکانی (اللّٰه) هەموویان سیفەتی بێ کەم و کورتین و تەواون بە هیچ جۆر و ڕوویەك کەم و کورتی (نقص)یان تیادا نەبووە و نییە و نابێت.

**(صفات الله العليا والكمال كلها صفات كمال لا نقص فيها بوجه من الوجوه)**

(اللّٰه) فەرموویەتی: ﴿وَلِلَّهِ الْمَثَلُ الْأَعْلَىٰ ۚ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ **النحل: ٦٠**

واتە: بۆ (اللە)یە نموونە و سیفەتی ئەوپەڕی بەرز و بڵند و ئەو زاڵی بەتوانای دانای کاربەجێیە.

**(المثل الأعلىٰ)**: الوصف الأعلىٰ: وەسف و ئاوەڵناوی زۆر بەرز و ئەوپەڕی بڵندیە.

**(والكمال المطلق من كل وجه)** تەواوی ڕەها لە هەموو ڕوویەکیەوە،

نموونە: (الحياة=ژیان و زیندوویەتی) و (العلم=زانست) و (القدرة=توانا) و (السمع=پێبیستراو) و (البصر=پێبینراو)... هتد ژیان و زیندوویەتی و زانست و توانا و پێبینراو و پێبیستراو و جگە لەوانەش سیفەتەکانی (اللە)ی بەرز و مەزن تەواوی ڕەهان (الكمال المطلق) و بێ کەم و کورتین و لەوپەڕی بەرزی و بڵندیدان.

بەڵگەی ژیری (**عقلي**):

هەر (**موجود**) بوویەك (**حقيقة**) تەواوەتی و ڕاستیەتی هەیە, هەر (موجود) و هەر بوویەکیش کە (حقيقة) و ڕاستی و تەواوەتی هەبێت, دەبێ سیفەتیشی هەبێت جا سیفەتی تەواو (کمال) یا (نقص) کەم و کورتی, سیفەتی کەم و کورت و (نقص) نابێ و شیاو نییە بۆ پەروەردگارێکی تەواوی شایستەی پەرستن, بەڵام ئەوانەی بە نارِەوایەتی ناویان ناوە پەرستراو (إلٰه) کە شایستەی پەرستن نینە بەڵگە نەویستە کە کەم و کورتن لە خود و لە سیفەت و کرداریشیان.. شیاون کە وەسف بکرێن بە دەستەوسانی (عجز) و کەم و کورتی (نقص), (اللّٰه)ی بەرز و مەزن هۆش و ژیری مرۆڤەکان دەجووڵێنێ و دەیاندوێنێت بەوەی کە پەرستراوەکان دەستەوسانن لە زۆرێك لە کار

و شتەكان و زيندووايەتی و ژيانيان كەم و كورتە و مردنی بەدواوەيە يا هەر لە بنەڕەتەوە بێ گيان و دەسەڵاتن.

**نموونەی:**

بت و سەنەمەكان كە جار وايە لە دار يا بەرد يا بەديهێنراوەكانی تری بێ گيان داتاشراون, (الله) فەرموويەتی: ﴿ وَالَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ لَا يَخْلُقُونَ شَيْئًا وَهُمْ يُخْلَقُونَ ﴾ ﴿ أَمْوَاتٌ غَيْرُ أَحْيَاءٍ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴾ النحل: ٢٠ / ٢١

واتە: ئەوانەی جگە لە (الله) داوايان لێدەكرێ و دەپەرسترێن هيچ بەديناهێنن و ئەوان بەديدەهێنرێن ئەوان مردوون و زيندوو نين هەستيش ناكەن كەی زيندوو دەبنەوە.

كە (**حس**) هەست, (**مشاهدة**) بينين سەلمێندراوە و جێگيرە كە بەديهێنراوان خاوەنی سيفەتی (كمال) تەواويەتی بە قەد خۆيانن, كەوابێ (اللّٰه)ی بەرز و مەزن شايستەترە كە بە قەد (كمال)يەتی زاتی خۆی سيفەتی تەواو (كمال) ڕەها و ئەوپەڕی بەرز و بڵندی بێ كەم و كورتی هەبێت كە خۆی بەخشەری تەواوی (كمال)يەتی بەديهێنراوەكانە.

**هەڵوەستەيەكی گرينگ:**

سيفەتێك: لە ئەگەری هەبوونی سيفەتێك لە ڕوو و حاڵ و بارێك تەواو (كمال)يەتی هەبێت ، بەڵام لە ڕوو و حاڵ و بارێكيش كەم و كورتی (نقص)ی هەبووبێت, ئەوە نابێت بەڕەهايی بۆ (اللّٰه)ی بەرز و مەزن جێگير (إثبات) بكرێت و نابێت بەڕەهايی (مطلق)يش

ڕەتبكرێتەوە (نفي) بكرێت, بەڵكو دەبێت درێژەی پێبدرێت لە ڕوو و باری (كمال) ی و تەواوەتیەكەوە بۆ (اللّٰه) جێگیر بكریَ, لە ڕوو و باری ناتەواوی (نقص)ەوە ڕەتبكرێتەوە و (نفي) بكرێت,

**نموونەيان:**

(**مكر, كيد, خداع**) و هاونموونەكانيشيان دەبنە سيفەتی تەواوی (كمال) بێ كەم و كورتی لە بەرامبەر (مكر, كيد, خداع)ی كەسێك كە ئەنجامی بدات ، (اللّٰه) لە پەرچەكردارياندا بەسەريان دابداتەوە و هەڵيانبوەشێنێتەوە تا بە تۆڵەی توند تۆڵەيان لێبكاتەوە ئەوە درووستە و لە (كمال)يەتی دەوەشێتەوە

(اللّٰه) فەرموويەتی: ﴿وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ اللَّهُ ۖ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ﴾

**الأنفال: ٣٠**

واتە: هاوبەش بڕیاردەران پیلان دەگێڕن (فێڵبازی دەکەن) و (اللّٰه)ش بۆ هەڵوەشاندنەوەی پیلان و فێڵەکانیان و پوچەڵکردنەوەیان (مکر)ی خۆی دەکات و (اللّٰه) باشترینی هەڵوەشێنەرەوە و پووچەڵکەرەوەی پیلان و فێڵەکانیانە بە (مکر)ی تەواوی ڕاستی شایستەی (کمال)یەتی (اللّٰه)ی بەرز و مەزن.

اللّٰه فەرموویەتی: ﴿ إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا ﴾ ﴿ وَأَكِيدُ كَيْدًا ﴾ **الطارق: ١٥-١٦**

واتە: بەڕاستی (کافر)ەکان ئەوان پیلانگێڕی و داو دەنێنەوە لە بڕواداران بە پیلانگێڕانێك ﷺ و (اللّٰه)ش فەرموویەتی: (منیش پلان و نەخشەی خۆم دەخەمە کار بە پلان و (کید)ێك بۆ هەڵوەشانەوەی پیلانگێڕی کافرەکان).

(اللە) فەرموويەتى: ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَهُوَ خَادِعُهُمْ﴾

**النساء: ١٤٢**

واتە: بەڕاستى دووڕووەكان بە تێگەيشتنى خۆيان فێڵ لە خواى دەكەن ئەو (اللە) لە بەرامبەر فێڵەكانيان بۆ پووچەڵكردنەوەيان دەيانخەڵەتێنێ و بەسەرياندادەداتەوە.

بەڵام ئەو سيفەت و كارانەى تەنياماناى خراپ و ناتەواوى (نقص)يان هەيە لە هەموو ڕوو و لا و حاڵ و بارێكدا, ئەوە بە هيچ جۆر و شێوازێك دروست نييە و نابێ بۆ (اللە) بگوترێ و بڕيار بدرێت،

**نموونە:**

(الخيانة) ناپاكى: (هيچ مانايەكى نييە لە هيچ بار و حاڵ و ڕووێكيەوە بە باش بێت)

(اللە) فەرموويەتی: ﴿وَإِن يُرِيدُوا خِيَانَتَكَ فَقَدْ خَانُوا اللَّهَ مِن قَبْلُ فَأَمْكَنَ مِنْهُمْ﴾ **الأنفال: ٧١**

واتە: ئەگەر دەیانەوێ ناپاکی (خیانەتت) لێ بکەن (ئەی مُحَمَّد ﷺ) بێگومان ناپاکی و خیانەتیان لە (اللە)ی کرد پێشتر و (اللە) تۆڵەی لێکردنەوە بەوەی ئێوەی براوە و زاڵ کرد بەسەریاندا.

لەو ئایەتەی وەکو ئایەتەکانیتر کە لە بەرامبەر (مکر) و (کید) و (خداع)ی کافر و مونافیقان (مکر) و (کید) و (خداع)ی مانای تەواوەیەتی (کمال) بۆ خۆی (اللە) بەکارهێنا.

بەڵام لێرەدا چونکە (خیانة) ناپاکی بە هیچ ڕوو و بارێکی مانای تەواویەتی نییە و نابێ (اللە) لە بەرامبەر (خیانة) و ناپاکیان وشەی (خیانة)ی بۆ خۆی بەکارنەهێناوە و بەشێوازێکی تر سەلماندی کە تۆڵەی ناپاکی (خیانة)کەی لێکردنەوە.

*وشەكانی (مكر, كيد, خداع) ماناكانيان زۆر لێك نزيكە بە كوردی بەو واتايانە دێت: (حيلە, فێڵ, گزی, خەڵەتاندن, فريودان, لەخشتەبردن) فەرهەنگی شيرين.

دەبێ بشزانين كە نابێ بە هيچ جۆرێك لە هەواڵدانی (اللّٰه) دەربارەی خۆی لە پەرچەكرداريدا بۆ كافر و مونافيقەكان (مكر, كيد, خداع)ی دەربڕی, ناوی (ماكر, كائد, خادع) بۆ (اللّٰه) وەرگرين لێيان و ڕيزی بكەين چونكە لە قورئان و فەرمودە نەهاتوون, لە بار و ڕووێكيشيانەوە مانای كەم و كورت و ناتەواو (نقص) دەگەيەنن, تەنيا دروستە وەكو لە ئايەتەكان هاتووە هەواڵيان پێبدەين دەربارەی (اللّٰه) لە تۆڵە و پەرچەكرداريدا بۆ كافر و مونافيقەكان وەكو خۆی فەرموويەتی بە بێ زياد و كەمكردنەوە لێيان. (واللّٰه أعلم).

## بنچينـەی دووەم:

باس و بابەتی سیفەتە بەرز و تەواوەکان فراوانترە لە باس و بابەتی ناوە زۆر جوانەکانی.

**(باب وموضوع الصفات العليا والكمال أوسع من باب وموضوع الأسماء الحسنىٰ)**

هەر ناوێکی زۆر جوانی (اللّٰه)ی بەرز و تەواوەکان لایەنی کەم سیفەتێکی تەواوی لەخۆوەگرتووە جا هەندێك لە سیفەتەکانیش پەیوەستن بە (فعل) کار و کردارەکانی, کار و کردارەکانی (اللّٰه)ی مەزنیش سنوور و کۆتایی و کورتهەڵێنانیان بۆ نییە.

**نموونە:** ئەو کار و کردارانەی (اللّٰه) کە لە هەندێك سیفەتەکانیەوە وەردەگیرێت و پێیانەوەپەیوەستن،

وەك: (المجيء=هاتن) و (الإتيان=هاتن)[١] و (الإمساك=گرتن) و (النزول=دابەزين)... هتد.

دەبێ بە بێ زياد و كەم كردنيان وەكو خۆيان چۆن هاتوون لە قورئان و فەرموودە بيانلێين و بڕوامان پێيان نەكەين بە هی بەديهێنراوەكان و چۆنيەكانيان چونكە نازانين, لێبگەڕێين و قسەيان دەربارە نەكەين, ناشبێ ناويان لێوەربگرين و دابتاشين بۆ (اللّٰه)ی بەرز و مەزن, بۆ نموونە بلێين:

(الجائي=هاتوو) و (الآتي=هاتوو, گەيشتوو) و (الآخذ=بگر, وەرگر) و (الممسك=گرەر)... هتد،

نابێ و دروست نييە ئەو ناوانە بۆ (اللّٰه)ی بگۆترێ, دەبێ تەنيا ئايەت و فەرموودەكان وەكو خۆيان مانا بكەين و بلێين.

---

(١):وشەكانی: (المجيء, الإتيان) ماناكانيان وەكو يەكە و بە مانای گەيشتن و هاتن دێت.

(اللّٰه)ى بەرز فەرموويەتى:﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا أَن يَأْتِيَهُمُ اللَّهُ فِي ظُلَلٍ مِّنَ الْغَمَامِ وَالْمَلَائِكَةُ وَقُضِيَ الْأَمْرُ ۚ وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ﴾ **البقرة: ٢١٠**

واتە: ئايە (كافران) چاوەڕوانى چى دەكەن؟! مەگەر (اللّٰه) و فريشتەكان لە سێبەرى پەڵە هەورى سپى بێتە لايان (مەبەست قيامەت و حەشر و حيسابە) ئەو كاتەى كار و شتەكان هەموو كۆتاييان پێهاتووە و هێنراوە (دەرگاى تەوبە دادەخرێت و دونيا كۆتايى دێت) بۆ لاى (اللّٰه) هەموو كار و فەرمانێك دەگەڕێتەوە.

(اللّٰه)ى بەرز فەرموويەتى:﴿وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا﴾**الفجر: ٢٢**

واتە: پەروەردگارت (ئەى مُحَمَّد ﷺ) دێت (بۆ يەكلاكردنەوەى دادگايى و حيساب لە مەيدانى حەشر و حيساب) و فريشتەش پۆل

پۆلن (واتە: پۆل پۆل لە خزمەت پەروەردگار لەو مەیدانیدا دێن و دەوەستن).

لە فەرموودەی (صحیح)یشدا هاتووە کە پێغەمبەر خوا ﷺ **فەرموویەتی:**

{ینزل ربنا إلىٰ السماء الدنيا كل ليلة حين يبقىٰ ثلث الليل الآخر, فيقول: هل من سائل فأعطيه؟! هل من مستغفر فأغفر له؟ هل من تائب فأتوب عليه؟} [(١)]

واتە: {پەروەردگارمان هەموو شەوێك لە كاتی مانەوەی سێیيەكی شەو دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا و دەفەرمووێ: ئایا داواكارێك هەیە پێی بدەم؟ ئایا كەسێ هەیە داوای لێ خۆشبوون بكات تا لێی ببورم؟ ئایا تەوبەكارێك هەیە تۆبەكەی وەرگرم؟

(١):البخاري: (١١٤٥ , ٦٣٢١) ومسلم: (٧٥٨)

## بنچینـەی سێیـەم:

سیفەتە بەرز و تەواوەکانی (اللّٰه) دابەش دەبن بۆ **دوو** بەش:

١- الصفات الثبوتية=سیفەتە جێگیرەکان.

٢- الصفات السلبيّة والمنفية=سیفەتە نەرێنییە ڕەتکراوەکان.

صفات اللّٰه العليا والكمال تنقسم إلیٰ **قسمين**:

١- الصفات الثبوتيّة

٢- الصفات السلبيّة والمنفية

١- الصفات الثبوتية=سیفەتە جێگیرەکان: [١]

بریتییە لەو سیفەتە تەواو بەرزانەی (اللّٰه) لە قورئانی پیرۆز جێگیری کردووە بۆ خۆی و پێغەمبەریش ﷺ لە فەرموودەکانی جێگیری کردووە

(١):الثبوت: به مانای: (جێگیر, ڕاوەستاو, دامەزراو) دێت.

بۆ (اللّٰه)ى بەرز و مەزن, هەموویان لەوپەڕی تەواوی و بەرزیدان بە هیچ شێوە و جۆرێك لە هیچ لا و ڕوویەكەوە كەم و كورتی و ناتەواوی (نقص)یان تیادا نییە وەكو سیفەتەكانی **(العلم=زانست)** **(الحیاة=ژیان و زیندوویەتی)** **(القدرة=توانا)** **( الوجه=ڕوو)** **(الیدین=دەستەكان)**...

پێویستە بەبێ گۆڕین (تحریف) ، وە پەكخستنی (تعطیل) و هاونموونەیەتی و چواندن (تمثیل و تشبیه) و چۆنیەتیكردن (تكییف) جێگیر بكرێن بۆ (اللّٰه)ى مەزن بەوەی لێیدەوەشێتەوە.

**٢**- الصفات السلبیة والمنفیة: سیفەتە نەرێنی و ڕەتكراوەكان بریتییە لەو سیفەتە كەم و كورتی و ناتەواوانەی كە (اللّٰه) لە قورئان و پێغەمبەریش ﷺ لە فەرموودەكان ڕەتیان كردوونەتەوە وەكو:,(الموت=مردن)،(النوم=نووستن)،(الجهل=نەزانین)

(العجز=دەستەوسانی و نەتوانین). . . هتد, پێویستە ڕەتبکرێنەوە و دژ و پێچەوانەکانیان بە شێوەی تەواوی گونجاو بۆ (اللّٰه)ی جێگیر بکرێن.

اللّٰه فەرموویەتی: ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى الْحَيِّ الَّذِي لَا يَمُوتُ﴾ **الفرقان: ٥٨**

واتە: (ئەی مُحَمَّد ﷺ) تۆ پشت ببەستە بەو زیندووەی کە نامرێت.

(الموت=مردن) سیفەتێکی نەرێنی ڕەتکراوەیە و کەم و کورت و ناتەواو (نقص)ە, دەبێ ڕەتبکرێتەوە لە پەروەردگار و دژ و پێچەوانەکەی کە (الحیاة=زیندوویەتی و ژیان)ی تەواوە بۆ (اللّٰه)ی جێگیر بکرێت و بڕوامان وابێ و بە بێ دوودڵی بڵێین (اللّٰه) زیندوویەکی خاوەنی ژیانێکی بێ سەرەتا و بێ کۆتایی بەردەوامە و هەرگیز مردنی بۆ نییە.

(اللّٰه) فەرموویەتی: ﴿اللَّهُ لَا إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ ۚ لَا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ۚ﴾ البقرة: ٢٥٥

واتە: (اللّٰه) هیچ پەرستراوێکی ڕەوا نییە جگە لەو زیندووەی ڕاگر, وەنەوزە و خەو نایگرێت.

لەو ئایەتەدا هەردوو بەش و جۆرەکانی سیفەتەکان باسکراوە و هاتووە:

**(الحي القيوم)** زیندووی ڕاگر. ئەوانە سیفەتە جێگیرە تەواو بەرزەکانن دەبێ وەکو خۆیان بە مانای ڕواڵەتی تەواویان بەو شێوەی لە (اللّٰه)ی دەوەشێتەوە جێگیر بکرێن.

**(سنة ولا نوم)** دوو سیفەتی نەرێنی ڕەتکراوەن کە مانایان (بۆرژان وەنەوزە و خەوە) دەبێ ڕەتبکرێنەوە و بەرامبەر و دژەکانیان کە ئاگایی تەواوە بۆ (اللّٰه) جێگیر بکرێن.

(الله) فەرموويەتی: ﴿وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا﴾ **الكهف: ٤٩**

واتە: پەروەردگارت ستەم لە هيچ كەسێك ناكات.

**(الظلم=ستەم)** سيفەتێكی نەرێنی ڕەتكراوەيە, دەبێ ڕەتيبكەينەوە و بەرامبەر و پێچەوانەكەی كە دادگەرييە بۆ (الله)ی پەروەردگار جێگير بكەين و بڕوامان وابێ و بڵێين (الله) خاوەنی دادوەرييەكی سەد لە سەدی تەواوی بێ كەم و كورتييە.

## بنچينـەی چوارەم:

سيفەتە جێگيرەكان سيفەتەكانی پياهەڵدان **(مدح)** و تەواوەتی **(كمال)**ن, هەرچەند زۆربن و بەڵگەبوونيان جۆر بێت, پێيانەوە تەواويەتی وەسفپێكراوی زياتر دەردەخا, لەبەرئەوەيە سيفەتە جێگيرەكان كە (اللّٰه) دەربارەی خۆی هەواڵی پێيانداوە زۆر زياترە لە سيفەتە نەرێنييەكان هەروەكو زانراوە.

**(الصفات الثبوتية صفات مدح وكمال, فكلما كثرت وتنوعت دلالتها ظهر من كمال الموصوف بها ما هو أكثر, ولهذا كانت الصفات الثبوتية التي أخبر الله بها عن نفسه أكثر بكثير من الصفات السلبية كما هو معلوم)**

ئەگەر وردبينەوە و ژيريمان بەكاربێنين بۆمان دەردەكەوێت كە:

تەواويەتی و (مدح) و پياهەڵدان لە سيفەتە جێگيرەكانەوەيە نەوەك لە سيفەتە نەرێنييەكان, ئەگەر كەسێك بە پاشايەك بڵێت: تۆ سەخی و ئازا و بەهێزی... هتد, ئەوە (مدح)ی كردووە و پێی خۆشە بەڵام ئەگەر پێی بڵێيت: تۆ زبڵ و خاشاك كۆكەرەوە و گسك لێدەر نيت و جلشۆر و خزمەتكار و چێشتلێنەر نيت و نموونەی ئەو قسانەی پێ بڵێی, ئەوە ڕەنگە پاشاكەی تووڕە بكات و بە (مدح) وەريان ناگرێت!!

(المعطلة) پەكخەرەكان زۆر پێداگر و موكڕن لەسەر سيفەتەكانی ڕەتكراوە و نەرێنی و سيفەتە جێگيرەكان باس ناكەن يان ڕەتيان دەكەنەوە و بڕوايان پێيان نييە..

بەڵام لە ديدگای ئەهلی سوننە و جەماعە بە بەڵگەی قورئان و فەرموودە سيفەتە نەرێنييەكان باس ناكرێت مەگەر لەو چەند حاڵ و بارەيدا نەبێت:

١- بۆ ڕوونكردنەوەی گشتیەتی تەواویەتی (اللّٰه) و سیفەتەكانیەتی:

(اللّٰه) فەرموویەتی:﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِير﴾الشورىٰ: ١١

واتە: هیچ شتێك وەكو (اللّٰه)ی نییە و ئەویش وەكو هیچ شتێك نییە و ئەو بیسەر و بینەرە.

﴿وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ﴾ الإخلاص: ٤

واتە: هیچ یەكێك نییە هاوكوف و هاوتا بێ بۆ (اللّٰه)ی.

٢- ڕەتكردنەوەی ئەوانەی درۆزنان هەڵیانبەستاوە دەرهەق بە (اللّٰه)ی پاك و بێگەردی بەرزی مەزن:

(اللّٰه) فەرموويەتی: ﴿أَن دَعَوْا لِلرَّحْمَـٰنِ وَلَدًا﴾ﷺ﴿وَمَا يَنبَغِي لِلرَّحْمَـٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا﴾ **مريم: ٩١-٩٢**

واتە: كاتێك بانگەشەی منداڵیان بۆ خوای ڕەحمان كرد,ﷺنابێ و نەشیاوە بۆ خوای ڕەحمان منداڵی هەبێت.

﴿وَأَنَّهُ تَعَالَىٰ جَدُّ رَبِّنَا مَا اتَّخَذَ صَاحِبَةً وَلَا وَلَدًا﴾ **الجن: ٣**

واتە: بەڕاستی پەروەردگارمان پایەبەرز و مەزن و گەورەیە نە هاوسەر نە منداڵی نییە.

**٣**-ڕەتكردنەوە و پاڵنانی گومان و (وهم)ەكانی كەم و كورتی و ناتەواوەتی (نقص)ی (كمال)یەتی و تەواوەتی كە پەیوەست بێت بە كار و ئیشێكی دیاریكراو..

(اللە)ى مەزن فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ﴾ ق: ٣٨

واتە: بەڕاستی بەدیمانهێنا ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لەنێوانیاندایە لە شەش ڕۆژیدا بێ ئەوەی ماندوو بین (ماندووبوونمان تووش بێت).

زانایان ڕا جیاوازن لەسەر (**ستّة أيام**) و ئەندازەکردنی:

١- (ستة أيام) مەبەست لێی (٦٠٠٠) شەش هەزار ساڵە.

٢- (ستة أيام) مەبەست لێی ملیۆنەها ملیۆنەها ساڵە.

٣- (ستة أيام) مەبەست لێی (شەش) (سەعات) کاتە, کە شەش چرکە دەگرێتەوە.

٤- (ستة أيام) مەبەست لێی (شەش ڕۆژە) وەکو ڕۆژە ئاساییەکانی ئێستای ژیانی دونیا.

ئەوە مانا ڕواڵەتییەکەیەتی و هیچ بەڵگەیەکی ڕاشکاوی دروست (صریح صحیح) نییە لەو مانایە ڕواڵەتییە لایبدات, کەواتە ئەوە ڕای پەسند و دروستە.

(والله أعلم)

## بنچينـەی پێنجـەم:

سيفەتە جێگيرەكان دابەش دەبێت بۆ دوو بەش:

١- سيفەتی خودی (**ذاتية**)

٢- سيفەتی كرداری (**فعلية**)

ئەگەر بگوترێ ئەو جۆرە دابەشكردنە لە قورئان و فەرموودە نەهاتووە و چۆن و بە چ بەڵگەيەك ئەهلی سوننە و جەماعە كردوويانە؟!

لە وەڵاميدا **دەڵێين**:

بە ناچاری بۆ سەلماندن و دەستەبەربوونی ڕاستيەتی بابەتەكە و (**مناط**)ی وەڵامدانەوەی ئەهلی كەلام و گروپ و تاقمە دەرچووەكان لە بازنەی ئەهلی سوننە و جەماعە و دژەكانيان, زانايانی ئەهلی سوننە و جەماعە هەڵساون بە ڕامان و وردبوونەوە و بەدواداچوون لە ئايەت

و فەرمووده‌کان وه ئەو کاره و دابەشەکەیان کردووه (اللّٰه) پاداشتیان بداتەوه.

(**الصفات الذاتية=سیفەته خودییەکان**): بریتییه لەو سیفەتانەی که (اللّٰه) له ئەهلی ئەوەلەوه بێ سەرەتا هەیبووه و ئێستاش بەردەوام هەیەتی و به بێ کۆتاش هەر دەیبێت.

**وەکو**: (**العلم**=زانست) و (**القدرة**=توانا) و (**السمع**=پێبیستراو) و (**البصر**=پێبینراو) و (**الحكمة**=دانایی و کارلەجێیی) و (**العظمة**=گەورەیی و مەزن)... هتد

**سیفەته هەواڵپێدراو (خبر)یەکانی** وەکو: (**العين**=چاو) و (**الوجه**=ڕوو) و (**اليد**=دەست) یش دەگرێتەوه.

**(الصفات الفعلية=سيفەتە كردارييەكان)**: بريتييە لەو سيفەتانەى كە پەيوەستن بە (إرادة) و ويستى (اللّٰه)ى بەرز و مەزن, گەر ويستى بيانكات دەيانكات, گەر نەشيويست نايانكات،

**وەكو**: (**الإستواء علىٰ العرش**) بەرز و بڵندبوونى سەر (عرش) و بارەگا و (النزول إلىٰ السماء الدنيا) دابەزين بۆ ئاسمانى دونيا..،

**هەندێ لە سيفەتەكانيش لە يەك كاتدا (خودى و كردارين) = (ذاتي و فعلي)**ين،

بۆ **نموونە**: (**الكلام**) قسەكردن سيفەتێكى خودى (ذاتي)يە كە (اللّٰه) لە ئەوەلەوە بێ سەرەتا سيفەتى قسەكردنى هەبووە و ئێستاش هەيەتى و بەردەواميش بێ كۆتا هەر دەيبێت- بەڵام - لە ڕووى تاكيەكانى قسە و گوفتار و وشە و ڕستەكان بەو ڕەچاوكردنەوە (كلام) قسە سيفەتێكى كردارى (فعلي)يە پەيوەستە بە ويستى (اللّٰه)يەوە قسەى كردووە و

دەيكات بەوەى ويستبێتیٚ و بەوەى بيەوێت, هەروەك فەرموويەتی:

﴿إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَن يَقُولَ لَهُ كُن فَيَكُونُ﴾ **يس: ٨٢**

واتە: بەڕاستى فەرمان و كارى (اللّٰه)يە ئەگەر شتێكى بووێت پێی بفەرمووێ ببە بیٚ دواكەوتن دەبێت.

وەنەبیٚ (اللّٰه)ى بەرز و مەزن بەردەوام بە بیٚ پچڕان دوابیٚ و وتەى فەرموبیٚ.

## بنچینـەی شـەشـەم:

لە جێگیرکردنی سیفەتەکانی دەخوازرێ و پێویست دەکات دووربوون و بەدەربوون لە دوو ئاگادارلێکراو و قەدەغە مەزنەکان:

١- هاووێنەکردن (**التمثیل**)

٢- چۆنیەتی بۆ دانان (**التکییف**)

**(یُلزَمُ في إثبات الصفات التخلي عن محذورین عظیمین؛ أحدهما: التمثیل والثاني: التکییف)**

(اللّٰه) هاووێنەی هیچ کەس و شتێك نییە و هیچ کەس و شتێکیش هاووێنەی (اللّٰه)ی نییە, (اللّٰه) لە زات و ناو و سیفەت و کرداری یەك و تاکە و هاوتا و هاووێنەی نەبووە و نییە و نابێت.

(اللّٰه) فەرموويەتی: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ ۖ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾

الشورىٰ: ١١

واتە: هيچ شتێك بەدڵنياييەوە وەكو (اللّٰه) نييە و ئەو بيسەر و بينەرە.

زانايان ڕا جياوازيان هەيە لەسەر ئەوەی كە (كاف)ی (كمثله) و وشەی (مثله) كە مانايان بە يەك شت دێت كە نموونە و وێكچوونە, ئايە چۆن لێكبدرێتەوە دروست و گونجاوە:

١- (كاف)ەكە زيادەيە و هيچ مانەيەكی ناگۆڕێت لە ئايەتەكەی بگۆترێ يان نا, ئەندازەكەی دەبێتە (ليس مثله شيء) هيچ كەس و شتێك بە نموونەی ئەو (اللّٰه)يەی نييە.

٢- (مثله) زيادەكەيە و هيچ لە مانايەكەی ناگۆڕێت لە ئايەتەكەی بگۆترێت يان نا, (ليس كهو شيء) هيچ شتێك نييە وەكو ئەو, مەبەست (اللّٰه)يە.

٣- (مثل) بە ماناى (ذات) خوود هاتووە.

٤- (مثل) بە ماناى سيفەت و وەسف هاتووە, هەروەكو ئايەتەكانى:

سورەتى يونس: ٢٤

(الله) فەرموويەتى: ﴿إِنَّمَا مَثَلُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَاءٍ أَنزَلْنَاهُ مِنَ السَّمَاءِ فَاخْتَلَطَ بِهِ نَبَاتُ الْأَرْضِ﴾...

واتە: بەڕاستى نموونەى ژيانى دونيا وەكو ئەو ئاوەيە كە دامانبەزاندووە لە ئاسمانەوە جا تێكەڵ دەبێت بە ڕووەكى زەوى...

مەبەست ئەوەيە (مثل) بە ماناى وەسف و سيفەت و حاڵ و بارى دونيا و ژيانەكەى وەكو سيفەت و حاڵى دابەزينى ئاو لە ئاسمان و ڕووەك و گياوگۆڕ پێيەوە شين بوون و ڕوانيان و دواتريش كۆتايى و نەمانيانە.

وە فەرموويەتى: ﴿وَلَهُ الْمَثَلُ الْأَعْلَىٰ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ الروم: ٢٧

واتە: سيفەت و وەسفى زۆر بەرز و ئەوپەڕى بڵند لە ئاسمانەكان و زەوى بۆ (اللّٰه)يە ئەو زاڵى بەتواناى دانايە.

ئەندازە و ماناكەى دەبێتە (**ليس كصفته شيء**) هيچ كەس و شتێك وەكو سيفەتى ئەوى نييە.

ڕاى تەواو و پەسند (واللّٰه أعلم) ئەوەيە كە لە باس و بابەتى دڵنياييكردنەوە و (توكيد)يە هەروەكو (اللّٰه) فەرموويەتى:

﴿أَفَمَن يَخْلُقُ كَمَن لَّا يَخْلُقُ ۗ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ النمل:١٧

واتە: ئايە (ئەوەی بەديدێنێ بەديهێنراوەكان كە (اللّٰه)يە وەكو ئەوەيە كە بەدينايەنێت (كە پەرستراوە نارەوايەكانن) ئايە بيرناكەنەوە و تێنافكرن؟)!

(اللّٰه) وێچوونی رەتكردۆتەوە بە دووبارەكردنەوەی وشە دڵنيايی داوە, وەك ئەوەی بگوترێ (اللّٰه) وشەكەی دووبارە كردۆتەوە بۆ دڵنياكردن (تأكيد)كردنەوەی نەبوونی هاوونيايەتی و رەتكردنەوەی, لە ئايەتی (ليس كمثل شيء. .) بە نموونەی ئايەتەكەی (**النمل**).

هەروەكو جێگير و زانراويشە لە بنچينەكانی رەوانبێژی (بلاغة) و زمانەوانی و راڤەی قورئان و شەرعيشدا (نكرة) بێژەی نەناسراو لە سياقی رەتكردنەوە گشتيەتی دەگەيەنێت (النكرة في سياق النفي تفيد العموم) جا ئەو ئايەتی (**الشورى:١١**) و ئەوەی سورەتی (**الإخلاص:٤**)

كە (اللّٰه) فەرموويەتی: ﴿وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ﴾

واتە: بۆ (اللّٰه)ی هیچ یەكێك هاوتا نییە.

ئەو بنچینە دەیانگرێتەوە بە ورد و درشت و گەورە و بچووكەوە هەموو هاووێنە و هاوتایەك لە هەموو كەس و شتەكان بۆ (اللّٰه)ی بەرز و مەزن لە ئەوەل و سەرەتا و ئێستاش و بەردەوام بە بێ كۆتا ڕەتكراوەن و نەبوونە و نینە و نابن.

گەر بگەڕێینەوە سەر ئەو ئایەتەی سورەتی (النمل) تەواو دڵنیا دەبین كە (اللّٰه) فەرموویەتی: ﴿أَفَمَن يَخْلُقُ كَمَن لَّا يَخْلُقُ ۗ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾

**النمل: ١٧**

واتە: ئایە ئەوەی بەدیدێنێ (بەدیهێنەرە) وەكو ئەوەی وایە كە بەدیناهێنێ و (بە خۆی بەدیهێنراوە) ئایا بیرتان ناخەنەوە و بیرناكەنەوە.

ئەوەی كەمترین ژیری هەبێت و بیربكاتەوە دەزانێ كە بەدیهێنەر و بەدیهێنراو لە یەك ناچن و لە یەكتر جودان.

(اللە) فەرموویەتی: ﴿. . .هَلْ تَعْلَمُ لَهُ سَمِيًّا﴾ مريم: ٦٥

واتە: ئایە دەزانی هاووێنە و هاوتا و یەكێك هەبێت لە (اللە)ی بچێ (لە خود و سیفەت و كردار).

لە علي كوڕی (أبي طلحة) لە (ابن عباس)یەوە خوا لێیان ڕازی بێت گوتوویەتی دەربارەی ڕاڤەی ئەو ئایەتەی: ﴿**هل تعلم للربّ مثلًا أو شبيهًا**﴾ [١]

واتە: ئایە دەزانی بۆ پەروەردگار هاووێنە و وێچوویەكی هەبێت.

---

(١):ئەوە ڕای (مجاهد) و (سعيد بن جبير) و (قتادة) و (ابن جريج) و جگە لەوانیشە.

(**التمثيل**=هاووێنەكردن) و (**التشبيه**=وێچواندن) دوو چەمك و زاراوەن بەڵام مانايان لە يەكتر جياوازە ئەگەر بۆ يەكتريش بەكارهێنرابن, بە كورتی ئەوە جياوازيەكانيانە:

١- (**التمثيل**=هاووێنەكردن) وەك يەكبوونە و يەك ئاست و يەكسانييە لە هەموو سيفەتەكانيانەوە, بەڵام (**التشبيه**=وێچواندن) وێكچوون و يەكبوونە لە هەندێك يان زۆرێك لە سيفەتەكانيا.

٢- (**التكييف**)=چۆنيەتيدانان: دروست نييە و نابێ چۆنيەتی (كيفية) بۆ زات و سيفەتەكانی (الله) دابنرێ و بگۆترێ چۆنيەتەكەيان ئاوا و ئاوايە, ئەوەی هەر چۆنيەتيەك دياری بكا بە خەياڵ يا بڕوا و گوتنيش, ئەوە دەبێ دڵنيا بێ (الله)ی بەرز و مەزن وانييە, نە زاتی و نە

سیفەتەکانی چونکە نابێ لە شتێکی بدوێ و خەیاڵی بکا و بەدوایدا بڕوات کە زانستی دەربارەی نییە،

(الله)ی پەروەردگار و پێغەمبەریش ﷺ زانست و زانیاریان پێمان نەداوە دەربارەی چۆنیەتی زات و سیفەتەکانی..

(الله) فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ﴾ **الإسراء: ٣٦**

واتە: بە دوای شتێك مەچوون لێی مەدوێ کە زانستت پێیەوە نییە..

بەڵگەی ژیری (**عقلي**):

لە **سێ** ڕێگەوە شتەکان دەناسرێن و دەتواندرێ (عقل) ژیری پەیان پێ ببات:

١- بینینی شت و زاتەکەی بە چاو.

٢- هاوتا و وێنەی شت و زاتەكەی بە چاو.

٣- هەواڵدانی كەسێكی متمانەپێكراوی ڕاستگۆ دەربارەی شت و خودەكەی.

جا هەر كەسێك شتێكی بینی بە چاو دەتوانێ چۆنیەتییەكەی بزانێ و وەسفی بكات و چۆنیەتی سیفەتەكانی بزانێ و بۆ خەڵكی باسی بكات..

جا هیچ كەسێك (اللّٰه)ی نەبینیووە تاكو بتوانێ قسە دەربارەی چۆنیەتی بكات و چۆنیەتی سیفەتەكانی باس بكات و لە قورئان و فەرموودەش كە دوو سەرچاوەی متمانەپێكراو و ڕاست و دروستی هەواڵ و زانست لێوەرگرتنن باسی چۆنیەتی سیفەتەكانی نەكردووە, كەوایە هیچ دەرگا و ڕێگایەك نییە و نەماوەتەوە بۆ (عقل) لێیەوە بدوێ دەربارەی چۆنیەتەكەیان, بەڵكو (عقل) و ژیری سەلامەت و تەواو ملدانە بۆ دەقەكانی قورئان و فەرموودە دەربارەی (اللّٰه) و ناو و

سيفەت و كردارەكانى, بە بێ زياد و كەم كردنى و گۆڕين و پەكخستن و هاووێنايەتى و چۆنيەتى دياريكردن و بڕواهێنانى دوودڵى و دانپيانانى سەد لە سەدە.

ئەوەش ئەوەى ناگەيەنێت كە چۆنيەتيان نييە بەڵكو ئێمە نايانزانيين و زانياريمان پێيان نييە و پێنەگەيشتووە تا قسەيان لێوە بكەين.

## بنچینەی حەوتەم:

سیفەتە بەرز و تەواوەكانی (اللە) وەستاوە و مەودای (عقل) ژیری تیادا نییە.

**(صفات الله العليا والكمال توقيفية لا مجال للعقل فيها)**

(عقل) ژیری ناتوانێ پەی ببا و درکی سیفەتە شایستەكانی (اللە) بکات کە (اللە) وەسفی خۆی پێیانەوە کردووە و پێغەمبەری خوا ﷺ وەسفی پێیانەوە کردووە..

پێشەوا (أحمد)ی کوڕی (حنبل) ڕەحمەتی خوای لێبێت گوتوویەتی:

**(لا يوصف الله سبحانه إلا بما وصفه فيه نفسه أو وصف به رسوله ﷺ لا يتجاوز القرآن والحديث)**

واتە: (اللە) وەسف ناكرێت مەگەر بەوەی خۆی پێوە وەسف كردووە یا پێغەمبەرەكەی ﷺ وەسفی كردووە تێپەڕ ناكات لە قورئان و فەرموودەوە.

**واتە**: سەرچاوەی وەرگرتنی سیفەت و وەسفەكانی (اللە)ی بەرز و مەزن تەنیا قورئان و فەرموودە دروست و (صحیح)ەكانی پێغەمبەری خوایە ﷺ لە هیچ سەرچاوە و شتێكیتر نابێ وەربگیرێت و یان عەقڵ و ژیریيان تیادا بەكاربهێندرێ و بڕیاریان لەسەر بدا و لێیان زیاد و كەم بكات, بەڵكو دەبێ مل بدات و تەسلیم بێت بۆ دەقەكانی قورئان و فەرموودە..

بەڵگەبوونی قورئان و فەرموودە لەسەر جێگیركردنی سیفەتی (اللە) سێ ڕووی هەیە:

١- ڕاشكاو دەربڕینی سیفەتەكە،

**نموونەی:**

**أ-** «علم» (اللّٰه) فەرموویەتی: ﴿وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ **البقرة: ٢٥٦**

واتە: (اللّٰه) بیسەری زانایە.

«العزیز» (اللّٰه) فەرموویەتی: ﴿فَإِنَّ الْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا﴾ **النساء: ١٣٩**

واتە: بەڕاستی عیززەت (باڵادەستی و زاڵییەتی) هەمووی بۆ (اللّٰه)یە.

**ب-** «القوة» (اللّٰه) فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ﴾ **الذاريات: ٥٨**

واتە: بەڕاستی (اللّٰه) ڕۆزیبەخش و خاوەنی هێزی تەواوی پتەوە.

**ج-** «الرحمة» (اللّٰه) فەرموویەتی: ﴿وَرَبُّكَ الْغَفُورُ ذُو الرَّحْمَةِ﴾ **الكهف: ٥٨**

واتە: پەروەردگارت لێبوردە و بەخشەری خاوەن بەزەیی (رحم)ە.

د- «البطش» (الله) فەرموويەتى: ﴿إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ﴾ **البروج: ١٢**

واتە: بەڕاستى گرتن و تۆڵەی پەروەردگارت (ئەی مُحَمَّد ﷺ) توند و بەزەبرە.

هـ- «الوجه» (الله) فەرموويەتى: ﴿وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ﴾ **الرحمان: ٢٧**

واتە: دەمێنێتەوە ڕووی پەروەردگارت خاوەنی شکۆ و مەزنی و ڕێز.

و- «اليدان» (الله) فەرموويەتى: ﴿وَقَالَتِ الْيَهُودُ يَدُ اللَّهِ مَغْلُولَةٌ ۚ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا بِمَا قَالُوا ۘ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَاءُ ۚ . . .﴾ **المآئدة: ٦٤**

واتە: جولەكە گوتوويانە دەستی (اللّٰه) بەستراو و گیراوەیە (مەبەستیان ڕەزیلی و بەخیلییە) دەك دەستەكانیان ببەسترێت و شەلەل بێت و نەفرینیان لێبووە بەوەی گوتوویانە بەڵكو هەردوو دەستەكانی كراوەن دەبەخشێ چۆنی بووێت.

٢- هەر ناوێك لە ناوە زۆر جوانەكانی (اللّٰه) لایەنی كەم سیفەتێكی لەخۆگرتووە, سیفەتەكە بە لەخۆوەگرتنی ناوەكەوە جێگیر بووە:

بۆ **نموونە**:

(الغفور=لێبوردە و بەخشەر) سیفەتی (لێبوردن و بەخشینی لەخۆوەگرتووە) كە (اللّٰه) فەرموویەتی:

﴿وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ﴾ **الملك: ٢**

واتە: (اللّٰە) ئەو زاڵی بەتوانای لێبوردەی بەخشەرە.

﴿وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ **يونس: ١٠٧**

واتە: (اللّٰە) ئەو لێبوردەی بەخشەری بەزەیی گەیەنەرە.

یەکێکیتر لە ناوە زۆر جوانەکانی (اللّٰە) {**السميع**}ە بیسەر, سیفەتی «السَّمْع» پێبیسەری لەخۆوەگرتووە.

کە (اللّٰە) فەرموویەتی: ﴿. . .وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ **البقرة: ٢٥٦**

واتە: (اللّٰە) بیسەری زانایە.

(اللّٰە) فەرموویەتی: ﴿. . .إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾ **النساء: ٥٨**

واتە: بەڕاستی (اللّٰە) بیسەری بینەرە.

**٣-** ڕاشكاو دەربڕینی كار و كردارێك یا وەسفێك كە بەڵگە بن لەسەر سیفەتەكانی (اللە), وەكو: (الاستواء علىٰ العرش) بەرز و بڵندبوونی لەسەر بارەگا و عەڕشی كە (اللە) فەرموویەتی: ﴿الرَّحْمَـٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ﴾ **طه: ٥**

واتە: (اللە)ی (رحمان) بەرز و بڵند بووە سەر عەڕش.

كە (استوىٰ) فرمان و كارە سیفەتی (استواء) بەرز و بڵندی بەوەی لە زاتی مەزن (اللە)ی دەوەشێتەوە لێیەوە جێگیر بووە و لەسەری بەڵگەیە.

یا هاتنی (اللە) بۆ یەكلاكردنەوە و دادگاییكردنی نێوان بەندەكان لە ڕۆژی دواییدا كە فەرموویەتی:﴿وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا﴾ **الفجر: ٢٢**

واتە: پەروەردگارت دێت (ئەی مُحَمَّد ﷺ) بۆ مەیدانی دادگایی و حەشر و حیساب لە ڕۆژی دواییدا و فریشتەش پۆل پۆلن (ڕیزدەبن و دەوەستن لەوکاتیدا).

(**جاء**) فرمان و کارەکە سیفەتی (مجيء) بۆ (اللّٰه) پێیەوە جێگیرە..

یا تۆڵەسەندنەوە لە تاوانبارەکان و (مجرمان) کە فەرموویەتی: ﴿إِنَّا مِنَ الْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ﴾ **السجدة: ٢٢**

واتە: بەڕاستی ئێمە تۆڵە لە تاوانباران (مجرمان) دەستێنین.

یا دابەزانی بۆ ئاسمانی دونیا کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {ینزل ربنا إلیٰ السماء الدنيا كل ليلة حين يبقىٰ ثلث الليل الآخر} [١]

---

(١):البخاري ٦٣٢١ ومسلم ٧٥٨

واتە: پەروەردگارمان دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا هەموو شەوێك لە كاتی مانەوەی سێیەكی شەوی كۆتا...

(ينزل) فرمان و كارە بەڵگەیە لەسەر جێگیربوونی سیفەتی (نزول) دابەزین بەوەی لە (الله) دەوەشێتەوە.

# چوار بنچینـەی بەڵگـەکانی ناوە زۆر جوان

# و سیفەتە بەرز و تەواوەکانی (اللّٰه)

## بنچینـەی یـەکـەم:

جێگیر نابێت ناوە زۆر جوان و سیفەتە بەرز و تەواوەکانی (اللّٰه)ی مەزن مەگەر لە ڕێگای قورئان و فەرموودە بێت.

**(لا تثبت أسماء الله الحسنیٰ وصفاته العلیا والكمال إلّا عن طريق الكتاب والسنة)**

تاكە سەرچاوە بۆ وەرگرتنی ناوە زۆر جوان و سیفەتە تەواو بەرزەكانی (اللّٰه)ی بەرز و مەزن **قورئانی پیرۆز و فەرموودە** دروست (صحيح)ەكانی پێغەمبەری دڵسۆزە ﷺ.

سێ ڕوو (**وجه**) هەیە بۆ هاتن (جێگیرکردن) و یا ڕەتکردنەوە و (نفي)کردنی ناوە زۆر جوان و سیفەتە تەواو بەرزەکانی (اللّٰه) لە قورئان و فەرموودە:

١- هەر ناو و سیفەتێکی هاتوو جێگیرکراوە بۆ (اللّٰه)ی لە قورئان و فەرموودە پێویستە جێگیر بکرێت بۆ **نموونە**:

**الاستواء**: بەرز و بڵندبوونی سەر عەڕش

**النزول**: دابەزینی بۆ ئاسمانی دونیا..

٢- هەر ناو و سیفەتێکی ڕەتکراوە (نفي) (نەبوون) بۆ هەر بێژە و نفي کراوێك لە قورئان و فەرموودە هاتبێت پێویستە ڕەتبکرێتەوە و دژ و

پێچەوانە تەواو (كمال)يەكانيان جێگير بكرێت. بۆ **نموونە**: (**الموت**: مردن, **النوم**: نووستن)

**٣-** لە ئەگەری جێگيرنەبوون و ڕەتكردنەوە (نفي) (نەبوون) بۆ هەر بێژە و (ناو و سيفەتێك) نابێ جێگير بكرێ و نابێ ڕەتيشبكرێتەوە, دەبێ پەيڕەوی قورئان و فەرموودە بەو شێوازەی بكرێت..

بەڵام دەربارەی ماناكەی دەبێ درێژبكرێتەوە ئەگەر مانايەكی تەواوی گونجاوی شايەنی (اللّٰه)ی دەبەخشی و هەيبوو و لێيەوە دەويسترا ئەوە وەرگيراو دەبێ بۆ (اللّٰه)ی بەرز و مەزن، ئەگەر مانايەكی ناتەواو يا نەشياو و نەگونجاو بۆ (اللّٰه)ی دەبەخشی و هەيبوو ئەوە پێويستە

ڕەتبكرێتەوە و نابێ وەربگیرێ و بۆ (اللّٰه)ی پاك و بێگەرد و بەرز و مەزن بگوترێ.

**نموونە**: **الجهة**: لا, جێگیرە كە (اللّٰه)ی بەرز و مەزن لەسەرووی ئاسمانەكانە و واتای (الجهة)لا.. یا مانای لای خوار و نزمی دەگەیەنێ و لێیەوە مەبەستە كە ئەوە بۆ (اللّٰه)ی نەشیاوە و پوچەڵە چونكە (اللّٰه)ی پاك و بێگەرد لەوەی مەزنترە كە هیچ شتێك لە بەدیهێنراوان دەوری بدا, یا مەبەست لە (الجهة) لای (جهة) و لای بەزر و سەر و بڵندییەك كە ئەویش یا مەبەست لێی بەرز و بڵندییەك كە دەوری شتەكان بدات ئەوەیان نەشیاوە و نابێت بۆ (اللّٰه)ی بەرز و مەزن, یا بەرز و بڵندییەك بە بێ دەوردان ئەو مانایە گونجاو و شیاوە بۆ (اللّٰه) چونكە ئەو (العلي العظيم) بەرز و بڵند و مەزن و لەسەرووی

بەدیهێنراوانییەتی و هیچ شتێك لە بەدیهێنراوان دەوریان نەداوە و ناشدەن.

(اللّٰه)ی بەرز و مەزن فەرموویەتی: ﴿. . . وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ﴾ **البقرة: ٢٥٥**

واتە: ئەو بەرز و بڵندە.

## بنچینـەی دووەم:

پێویستە دەربارەی دەقەکانی قورئان و فەرموودە بڕوێندرێت لەسەر ڕواڵەتە (ظاهر)یەکانیان, بە بێ (تحريف) گۆڕین, بە تایبەتی دەقی سیفەتەکان چونکە مەودای بۆ ڕاوبۆچوونیان تیادا نییە.

**(الواجب في نصوص الكتاب والسنة إجراؤُها علىٰ ظاهرها دون تحريف لا سيما نصوص الصفات حيث لا مجال للرأي فيها)**

قورئانی پیرۆز بە زمانی عەرەبییەکی ڕەوان و ڕوون و ئاشکرا دابەزیووە و فەرموودەکانی پێغەمبەریش ﷺ هەر بەو زمانە و لەوپەڕی ڕەوانبێژی و (بلاغة) و ڕوونی دەربڕاون, کەواتە هەردوو سەرچاوەکان بە زمانی عەرەبی پاراو و ڕوون هاتوونە و دەبێ مانا و واتایەکانی دەقەکانیان بە مانای ڕواڵەتی (ظاهر)ی بێژە (لفظ) و وشە و چەمکەکان بکرێن و

لێكبدرێنەوە, مەگەر (مانع) قەدەغەكارێكی شەرعی هەبێت بۆ لێكدانەوە (ظاهر)ی و ڕواڵەتییەكەی..

(اللە) فەرموویەتی: ﴿نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ ۝ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنذِرِينَ ۝ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ﴾ **الشعراء: ١٩٣-١٩٤-١٩٥**

واتە: جبریل ی ئەمین قورئانی دابەزاندە سەر دڵی تۆ (ئەی مُحَمَّد ﷺ) تاكو ببیتە لە ترسێنەران, بە زمانی عەرەبی ڕەوان و ڕوون و پاراو.

﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ **یوسف: ٢**

واتە: بەڕاستی ئێمە قورئانمان بە عەرەبی دابەزاندووە تاكو ژیر بن و لێی تێبگەن.

گۆڕین و لادان لە ڕواڵەتی بێژە و ڕستە و ماناكانیان لە دەقەكان بە بێ هیچ پاساو و بیانووێكی شەرعی و یا بوونی قەدەغە و (مانع)ێكی شەرعی بۆ مانا ڕواڵەتییەكانیان زەمكراو و ڕەتكراوەیە لە لای پەروەردگار و (اللّٰه)ی بەرز و مەزن, جوولەكەكان لەسەر (تحریف) و گۆڕین و لادانی وتە و فەرمانەكانی (اللّٰه)ی دەشكێنێتەوە و زەمیان دەكات،

كە فەرموویەتی: ﴿أَفَتَطْمَعُونَ أَن يُؤْمِنُوا لَكُمْ وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ مِن بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ **البقرة: ٧٥**

واتە: ئایا ئێوە ئەی بڕواداران بە تەمای ئەوەن كە خەڵكێكی ئاوای وەكو جوولەكە بڕوابێنن و پێتان بڕوا بكەن, بێگومان تاقم و كۆمەڵێك

لەوان گوێبیستی فەرمووده (قسەی) (اللّٰه)ی دەبن لە پاشان کە لێیەوە تێگەیشتن دەیگۆڕن و لە ڕواڵەتەکەی لادەدەن و ئەوان دەشزانن.

بەڵگەی ژیری (**عقلي**):

حاشا هەڵنەگر و بەڵگە نەویستە کە (متكلم) گوفتارکار و وتەبێژ زاناترە لە کەسێکی تر بە مەبەست و ویستی لە گوفتار و وتەکەی کە دەریدەبڕێت،

**کەواتە**: (اللّٰه)ی پەروەردگار بە زمانی عەرەبی ڕەوان و پاراو قورئانی ناردووە و ئێمەی دواندووە, بۆیە پێویستە مانا ڕواڵەتییەکانی وتەکانی لێوەربگرین و بیانلێین ئەگەر وانەکەین بۆچوونەکان جیاواز دەبن و ئوممەتی بڕوادار پەرتەوازە دەبن.

## بنچينـەی سێيـەم:

لە لایەك و ڕوویەكیەوە ڕواڵەتی دەقی سیفەتەكانی (اللّٰه)ی دیار و زانراوە بۆمان, لە لایەكیتر و ڕووەكیترەوە نادیار و نەزانراوە, بەرِەچاوكردنی مانا و واتا بۆمان دیار و زانراوە, بەرِەچاوكردنی چۆنیەكانیان كە هەیانە و لەسەریانە نادیار و نەزانراون.

**(ظواهر نصوص الصفات معلومة لنا بإعتبار ومجهولة لنا بإعتبار آخر: فبإعتبار ومن جهة المعنىٰ هي معلومة, وبإعتبار ومن جهة الكيفية اللتي هي عليها مجهولة)**

ئەگەر مانا و واتاكانی دەقەكان نادیار و نەزانراو بێ ئەوا دابەزینی قورِئان و وتەكان و فەرموودەكانی خوا و پێغەمبەرەكەی ﷺ كەڵكیان لێوەرناگیرێ و سوودیان نابێت, جا (اللّٰه)ی پەروەردگار كە لە قورِئانی

پیرۆز فەرموویەتی ئایەتەکانی قورئانم بۆتان دابەزاندووە و ناردووە تاکو لێیان ووردببنەوە و تێبگەن لێیان و بە زمانی عەرەبییەکی ڕەوان و پاراو ناردوومە و دامبەزاندووە تاکو ژیری لێوەرگرن و تێبگەن لێیەوە, وە بەڵگەی ڕاست و ڕاشکاون لەسەر زانراویی و دیاری ماناکانی ئایەت و دەقەکان.

(اللە) فەرموویەتی: ﴿كِتَابٌ أَنْزَلْنَاهُ إِلَيْكَ مُبَارَكٌ لِيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ وَلِيَتَذَكَّرَ أُولُو الْأَلْبَابِ﴾ ص:٢٩

واتە: قورئان پەرتوکێکە دامانبەزاندووە بۆ تۆ ئەی مُحَمَّد ﷺ بەپیت و بەرەکەتدار و پیرۆزە تاکو لە ئایەتەکانی ووردبنەوە و تێبگەن و تاکو خاوەن ژیری و فامیەکان تێفکرن و پەند و ئامۆژگاری لێوەرگرن.

**(التدبّر)** ووردبوونەوە و تێگەیشتن لە ئایەتەکان نابێت مەگەر بە تێگەیشتن لە مانا و واتاکانیان نەبێت, جا پەند و ئامۆژگاری وەرگرتنیش لێیان بە زانین و تێگەیشتن لێیانەوە دەبێت،

کەواتە: سەلمێندراوە کە (التدبر) ووردبوونەوە بە تێگەیشتن لە ماناکان دەبێ تا پەند و ئامۆژگاریان لێوەربگیرێت.

قورئان بە زمانی عەرەبی ڕەوان و پاراو و فەرموودەکانی پێغەمبەریش ﷺ بە هەمان شێوەیە, جا ئەوەی زمانی عەرەبی بزانێ و لێی شارەزابێ ئەوە لە مانای قورئان و فەرموودە و دەقەکانیان تێدەگات.

هەر بۆ ئەوەشە (اللّٰه) فەرموویەتی:

﴿إِنَّا جَعَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ الزخرف: ٣

واتە: ئەو پەرتوكەمان كردۆتە قورئانێكی عەرەبی تاكو هۆش و ژیریتان بخەنە كار و لێیەوە تێبگەن و پەیرەوی بكەن.

بەڵگەی ژیری (**عقلي**):

ناكرێ و ناگونجێ كە (الله)ی دانا و زانا پەرتوكێكی وەكو پرۆگرام بۆ مرۆڤەكان دابەزاندبێ كە لەسەری برۆن و پەیرەوی بكەن و پێغەمبەرەكەی مُحَمَّد ﷺ ناردبێت بە قسە و وتەیەك دوابێت.. كە مەبەست لە قورئان و فەرموودەكانی پێغەمبەرەكەی ﷺ رێنوێنی خەڵك بێت و واتا و مانای وتەكانیان نادیار و نەزانراو بن كە خەڵكی لێیان تێنەگەن! ، ئەوكات ئەگەر وابا پەنا بە (الله) نەزانی و نەفامی و كاری نابەجێ بوو, بێ مانا دەبوو داواكردنی پەیرەوكردن و شارەزابوون و

زانست وەرگرتن لێیانەوە کە هەرگیز ئەوە لە (اللە)ی (العلیم الحکیم) زۆر زانای دانای کارلەجێ ناوەشێتەوە.

(اللە) فەرموویەتی: ﴿. . .كِتَابٌ أُحْكِمَتْ آيَاتُهُ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ﴾ **هود: ١**

واتە: ئەو قورئانە پەرتوکێکە ئایەتەکانی تەواو پتەون و هیچ کەم و کورتی و دژیەکیان تیادا نییە، لە پاشان درێژکراوەتەوە و ڕوونکراوەتەوە لە لایەن زاتێکی دانای کارلەجێی شارەزا و ووردزان.

## بنچینـەی چوارەم:

ڕواڵەتی دەقەکان ئەوەیە کە ماناکانی یەکسەر بۆ هزر و مێشك بێت, ئەویش جیاواز دەبن بەگوێرەی (سیاق)یان.

**(ظاهر النصوص ما يتبادر منها إلىٰ الذهن من المعاني, وهو يختلف بحسب السياق)**

کەسێکی زمانزان و شارەزا ئەگەر ڕستە و وتەکانی خوێندەوە بە بێ بیرکردنەوەی قووڵ و بەدواداگەڕان لە سەرەتاوە ماناکەی بێتە هزری و بزانێ ئەوەیە مانا ڕواڵەتییەکەی (المعنىٰ الظاهر) بێژە و ڕستەکەی،

بەڵام جار وایە دوو بێژە (لفظ) لە ڕواڵەتی پیت و نووسین وەکو یەکن و هیچ جیاوازیەکیان نییە, بەس لە مانا و واتا لە یەکتر جیاوازن و

هەریەکەیان مانا و واتایەکی تایبەت بەخۆیەوە دەگەیەنێت بەگوێرەی (سیاق)ەکەی...

(اللە) فەرموویەتی: ﴿. . .لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ﴾ ص: ٧٥

واتە: (اللە)ی پەروەردگار (إبلیس) دەدوێنێ و پرسیاری ڕێگر (مانع)ی کڕنووشبردنی بۆ ئادەمی (علیه السلام) لێدەکات؟

بۆ کڕنووشت نەبرد بۆ ئەوەی بە دوو دەستەکانم بەدیمهێناوە؟

لەو ئایەتەی یێژەی (لفظ)ی (**بيدي**) دەستەکانم ئەگەر لەگەڵ ڕستەی وتەی مرۆڤێك کە بڵێ (**صنعت الكرسي بيدي**) واتە: کورسییەکەم بە دوو دەستەکانم دروستکردووە..

(بيدي) ماناکانیان زۆر لەیەکتر جیاوازە و واتای یەکتر ناگەیەنن ئەگەر لە پیت و دەربڕینیش وەکو یەکتر بن..

دوو دەستی (اللە) ڕاستە مانا ڕواڵەتییەكەی لێوەردەگیرێ بە واتای (دەست) دێت بەڵام بە هی هیچێك لە بەدیهێنراوانی ناچێت و لە خۆی دەوەشێتەوە..

ئی مرۆڤەكەش بریتیین لە دوو دەستی مرۆڤ كە چۆنیەتییەكەیان دیار و ئاشكرایە و لە مرۆڤەكەی دەوەشێتەوە.

خەڵكی دەربارەی ڕواڵەتی دەقی سیفەتەكانی (اللە)ی بەرز و مەزن سێ بەشن:

١- ڕواڵەتە یەكسەر هاتووەكەی بۆ هزر و مێشك دەكەن, واتایەكی ڕەوا و دروستی لێوەشاوە بە (اللە)ی پاك و بێگەرد دەدا و بەڵگایەتییەكەشی دەهێڵنەوە لەسەر ئەوە،

ئەوەیە ڕا و ڕێڕەوی ڕاست و دروست كە پێشینانی چاك (**السلف الصالح**) و ئەهلی سوننە و جەماعە لەسەری بووینە و بڕوایان پێبووە.

ڕاست و دروستی ئەو ڕا و ڕێڕەوە لە دوو ڕوو و لاوەیە:

**أ-** جێبەجێكردنی تەواوی ئەوەیە كە قورئان و فەرموودە لەسەری بەڵگەنە.

**ب-** ئەو ڕاستی و ڕەوایەتییەیە كە پێشینی چاك (السلف الصالح) لە هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێت و شوێنكەوتووانیان ڕەحمەتی خوایان لێبێت فەرموویانە و لەسەری بووینە.

**٢-** ڕواڵەتە یەكسەر هاتووەكەی بۆ مێشك و هزر لە دەقەكانی سیفەتەكان بە مانای پوچەڵی نەشیاو بە (اللّٰە)ی پاك و بێگەرد

دادەنێن كە ئەوە وێچوواندن (تشبيه)ە ئەو ڕاو و ڕێڕەوە لەبەر ئەو ڕووانە پوچەڵ و قەدەغە و حەڕامە:

**أ-** زێدەڕەوی و تاوانە بەسەر دەقەكانی و پەكخستن و (تعطيل)كردنيانە لە مانای مەبەست و ويستبوون پێيانەوە,

(الله) فەرموويەتی: ﴿. . .لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾ **الشورىٰ: ١١**

واتە: هيچ كەس و شتێك وەكو (الله)ی نييە و نموونەی ئەو نييە و (الله)ش وەكو هيچ كەس و شتێك نييە.

**ب-** ژيری و (عقل) بەڵگەيە لەسەر جياوازی بەديهێنەر لە بەديهێنراو لە خود (ذات) و سيفەتيدا, كەوابێ چۆن بڕيار بە بەڵگايەتی دەقەكان لەسەر لێكچوون لەنێوانياندا دەدرێت؟!

ئەوە پێچەوانە و دژی ژيری (عقل)ە.

**ج-** ئەو ڕا و تێگەیشتنە پێچەوانە و دژە بە ڕا و تێگەیشتنی پێشینانی چاك (السلف الصالح) كە باشترین مرۆڤی چاخ و سەدە بووینە.

**٣-** مانا ڕواڵەتییەكەی یەكسەر دێتە هزر و مێشك لە دەقی سیفەتەكان ، هەیانە بە مانایەكی پوچەڵی نەشیاو بۆ (اللّٰه)ی داناوە كە ئەوە وێچوواندن و (تشبیە)ە جا ئەوان لەبەرئەوە نكوڵیان كردووە لەوەی كە بەڵگەبووە لەسەر مانایەكی شیاو بۆ (اللّٰه) تاكو بە حیسابی خۆیان تووشی وێچوواندن (تشبیە) نەبن ئەوانە پەكخەران و خەڵكی (تعطیل) و پەكخەرن, پەكخستن (تعطیل)ەكە یان گشتی (عام) بێت دەربارەی ناوەكان و سیفەتەكان بێت, یا تایبەت بێت لە هەردووكیاندا, یا لە یەكێكیان چ ناوەكان چ سیفەتەكان،...

ئەوانە دەقەكانيان گۆڕيووە (**تحريف**)يان لە ڕوواڵەتەكاندا كردووە بۆ مانايانێك كە بەگوێرەى عەقڵيان دياريانكردووە, لە دياريكردنەكەشيان ڕاڕايەتى و جياوازى زۆرى تێكەوتووە ناويانناوە (**تأويل**)**(١)** لێكدانەوە بەڵام لەڕاستيدا گۆڕين و لادان (**تحريف**)ە**(٢)**, ئەو ڕێڕەوەش پوچەڵە لەو ڕووانەوە:

**أ-** تاوانە و زێدەڕەويە لەسەر دەقەكان كە كرديتيانە بەڵگە لەسەر مانايەكى پوچەڵى نەشياو بە (اللّٰه)ى مەزن پێيەوە دوواوە (خطاب)ى كردووە لەگەڵ بەندەكانى بە زمانێكى ڕەوان و پاراو كە عەرەبييە تاكو پێيەوە بفامێن و ژيرى وەرگرن بە تێگەيشتن لە وتە و (كلام)ەكەى، ئەو ڕەوانى و پاراوى زمانە عەرەبييەى پێيەوە دوواوە دەخوازێ و پێويست دەكات تێيبگەن و ماناكەى بزانن, پێغەمبەريش ﷺ

بەبەرچاوانەوە بە شايەدی دۆست و دژەكانی زمانزان و ڕەوانبێژ بە پاراوترين و ڕوون و ڕەوانترين زمانی مرۆڤ خەڵكی دوواندووە و فەرموودەی فەرمووە،

كە ئەوە پێويست دەكات فەرموودەكانی (اللَّه) و پێغەمبەرەكەی ﷺ لەسەر ڕواڵەتە لێتێگەيشتووەكەی ئەو زمانە عەرەبييەی لێكبدرێتەوە و (حمل)ی پاك و بێگەرد و بەرز و مەزن, (حمل) بكرێ بە بێ وێچوواندن و نموونەدانان (تمثيل و تشبيه) و چۆنيەتيكردنيان بۆ (اللَّه)ی پاك و بێگەرد و بەرز و مەزن, كەچی ئەوان وتە و فەرموودەی (اللَّه) و پێغەمبەرەكەی ﷺ لە مانا ڕواڵەتييەكەی دەگۆڕن و لێيەوە لادەدەن.

**ب-** گۆڕین و لادانی فەرموودەی (اللہ) و پێغەمبەرەکەی ﷺ لە مانا ڕواڵەتییەکەیان بۆ مانایەکی پێچەوانەیان قسە و دوانە بەسەر (اللہ)ی بەرز و مەزن بە بێ شارەزایی و زانستەوە کە ئەوەش قەدەغە و حەڕام و تاوانە..

(اللہ) فەرموویەتی: ﴿قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَالْإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُوا بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا وَأَن تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ **الأعراف: ٣٣**

واتە: پێیان بڵێ ئەی مُحَمَّد ﷺ بەڕاستی پەروەردگارم هەموو زێدەڕەوی و گوناهەکانی ئەوانەی ئاشکران و پەنهان و نادیارن لێیانەوە قەدەغە و حەڕامی کردووە, وە هەموو گوناهـ و دەستدرێژییەکی بە ناحەق و, نارەوایەتی و هاوبەشیدانان بۆ (اللہ) کە هیچ بەڵگەیەکی

(تەواويان) بۆ نەهاتووە پێنەدراوە بۆ ئەوەيان, يان بدوێن و قسەى بكەن بەسەر (اللّٰه)يەوە بە بێ ئەوەى زانستيان هەبێ و بيزانن.

وە فەرموويەتى: ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ﴾ **الإسراء: ٣٦**

واتە: بە دواى شتێك مەچوو لێى مەدوێ كە زانستت پێيەوە نييە.

جا ئەوەى مانا ڕواڵەتييەكەى فەرموودەكانى (اللّٰه) و پێغەمبەرەكەى ﷺ دەگۆڕێ و لێيان لادەدا و پێچەوانەيان دەكات, ئەوە بەدواى شتێك چووە و لێيەوە دوواوە كە زانستى پێيەوە نەبووە و نييە و, دوواوە بەسەر (اللّٰه) بە بێ شارەزايى و زانست هەبوون, ئەوە لە **دوو** ڕووەوە وايە:

**یەكەم:** ئەو وایداناوە کە مەبەست و ویست لە فەرموودەی (اللە) و پێغەمبەرەکەی ﷺ ئاوایە کە ئەو دایناوە و لێیەوە دوواوە لەگەڵ ئەوەی کە مانا ڕواڵەتیەکەی وانییە و ئەو گۆڕیویەتی و وای بۆچووە و دایناوە کە ویستی مانا ڕواڵەتییەکە نییە, مانایەکیتری جگە لەوە کە مانا ڕواڵەتییەکە نایگەیەنێت.

**دووەم:** دایناوە دوای هەڵبەستووەکە کە ویست و مەبەست لە فەرموودەی (اللە) و پێغەمبەرەکەی ﷺ ئاوا نییە کە مانایە ڕواڵەتییەکەیانە کە ڕواڵەتی فەرموودەکانیش هەر ئەو مانا ڕواڵەتییە دەگەیەنێت.

٤- پوچەڵكردنەوەی ڕێڕەوی پەكخستن (تعطیل) لە وشەیەكەوەیە گۆڕین و لادانی دەقی سیفەتەكان لە ڕواڵەتەكانیانەوە پێچەوانە و دژە بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی ـ خوا لێیان ڕازی بێت ـ و پێشینانی ئوممەت و پێشەوایانی لەسەری بووینە و لەسەری ڕۆیشتوونە, بەڵێ ئەوەی پێچەوانە و گۆڕین و لادان لەو ڕەوایەتی و حەقیانەتیانە بێگومانەی ڕێباز و ڕێگای ڕاست و دروستی پێغەمبەر ﷺ و پەیڕەوانی لە صەحابە و هاوەڵانی و پێشینان و پێشەوایانی ئوممەتەكەی بكات پوچەڵ و ناڕەوایەتییە.

٥- پوچەڵی ئەو ڕێڕەوە و ناڕەوایەتییەكەی بەوەش دەردەكەوێت كە ئەو پرسیارانەی لە داهاتوو دەربارەی ئەو دەقانەی لە قورئان و

فەرمووده هاتوون لێیان بکرێت و بە پەکخەر (المعطل)ەکەی بگووترێ:

**أ-** دەربارەی دەقەکانی قورئان:

***** ئایا تۆ زاناتری بە (اللّٰه)ی پەروەردگار لە خۆی؟

دەبێ بڵێ: نەخێر.

***** ئایا ئەوەی (اللّٰه) دەربارەی خۆی فەرموویەتی ڕاست و ڕەوایە؟

دەبێ بڵێ: بەڵێ.

***** ئایا هیچ وتەیەکی ڕەوان و ڕاشکاوتر لە فەرموودەی (اللّٰه)ی دەزانی هەبێت؟

دەبێ بڵێ: نەخێر.

* ئایا گومانی ئەوەت هەیە کە (اللّٰه)ی بەرز و مەزن ویستوویەتی ڕەوایەتی ڕاستییەکان بشارێتەوە لە بەدیهێنراوە مرۆڤەکان دەربارەی دەقی سیفەتەکان تاکو ئەوان بەگوێرەی ژیری و (عقل)یان مانای بکەن و بۆیان دابنێن؟

دەبێ بڵێ: نەخێر.

**ب-** دەربارەی دەقەکانی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ:

* ئایا تۆ زانا و شارەزاتری لە پێغەمبەری خوا ﷺ بە (اللّٰه)ی پەروەردگار؟

دەبێ بڵێ: نەخێر.

* ئایا هیچ کەس هەیە لە خەڵکی و مەردوم زمان پاراوتر و ڕەوانتر و دڵسۆزتر بێ لە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ بەندەکانی (الله)؟

دەبێ بڵێ: نەخێر.

**جا بە دوای ئەو پرسیارانەوە ئەو پرسیارانەشی ئاڕاستە بکرێت:**

* ئایا هیچ زیانەکت پێدەگات ئەگەر ئەوەی (الله) و پێغەمبەرەکەی ﷺ جێگیریان کردووە بۆ (الله)ی پەروەردگار لە قورئان و فەرموودە بەو ڕووەی کە لە (الله)ی بوەشێتەوە و شایستە بێت بۆی جێگیریان بکەیت؟

* ئایا ئەوە بۆت سەلامەتتر نییە و بەهێزتر نییە لەسەری بڕۆی و بڕوات وابێ و بڵێی و جێگیری بکەیت بە بێ گۆڕین و وێچوواندن و

نموونەبۆدانان و چۆنیەتیکردنی ناو و سیفەتەکانی (اللە) و دەقەکانی قورئان و فەرمووده دەربارەیان, بۆ وەڵامت لە ڕۆژی دواییدا هەر كە پرسیارت لێکرا و پێتگوترا

﴿مَاذَا أَجَبْتُمُ الْمُرْسَلِينَ﴾ القصص: ٦

واته: لە ڕۆژی دواییدا بانگیان لێدەکرێ و پێیان دەگوترێ: بە چی و چۆن وەڵامی ڕەوانەکراوانتان داوەتەوە؟...

٦- شێوازەکی تری پوچەڵکردنەوەی ڕێڕەوی پەکخەران (أهل التعطيل) ئەوەیە کە ئەو ڕێڕەو و بۆچوونەی (تعطيل) چەند خواستن و پێویستی و (لازم)یەتێکی لێدەکەوێتەوە کە پوچەڵن, جا پوچەڵی

(لازم) پێویستكار بەڵگەیە لەسەر پوچەڵی لەو پێویستكار و خواستنیانە ، وەک ئەمانە:

**أ-** لەبەرئەوەی بڕوایان وایە كە نەگۆڕینی دەقی سیفەتەكان و لانەدانیان لە مانایە ڕواڵەتی(ظاهر)یەكانیان, وێچوواندنی (اللّٰه)ی بە بەدیهێنراوان لێدەكەوێتەوە و پێویستی دەكات, وێچوواندنی (اللّٰه)ش بە بەدیهێنراوان كوفرە چونكە بەدرۆهێنانەوەی فەرمودەی (اللّٰه)یە:

﴿. . .لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾ الشورىٰ: ١١

مامۆستا و شێخەكانی پێشەوا **(البخاري)** ڕەحمەتی خوای لێبێت گوتوویانە:

**(من شبه الله بخلقه فقد كفر, وَمن جحد ما وصف الله به نفسه فقد كفر وَليس ما وصف الله به نفسه ولا رسوله تشبيها)...**

واته: ئەوەی (اللە)ی بە بەدیهێنراوانی بچووێنێ بێگومان کافر بووە, و ئەوەی نکوڵی لەوەی بکات کە (اللە) خۆی پێوە وەسف کردووە بێگومان کافر بووە, ئەوەی (اللە) خۆی پێوە وەسف کردووە و پێغەمبەرەکەشی ﷺ پێیەوە وەسفی کردووە هیچ وێچوواندنی تیادا نییە.

جا بەڕاستی لە هەموو پوچەڵیان پوچەڵیتر ئەوەیە بگووترێ لانەدان و نەگۆڕینی مانا ڕواڵەتییەکان وێچوواندنی تیایە, بە هیچ جۆرێکی وێچوواندنی تیادا نییە و نابێت ماناکردنی دەقەکان بە مانا

ڕواڵەتییەكانیان چونكە بڕوای ئەهلی سوننە و جەماعەی وایە كە مانای سیفەتەكانی (الله) و جێگیركردنیان بە مانایە ڕواڵەتییەكانیانە بە بێ چۆنیەتی و نموونە هەبوونیان بەوەی لە (الله)ی دەوەشێتەوە بڕیاردەدرێ و دەكرێت.

**ب-** پەرتوكی خوای كە قورئانی پیرۆزە كە ڕێنوێنی و ڕوونكردنەوەی هەموو شتێكی بۆ خەڵكی تیایە و شیفای دڵان و ڕووناكی و ڕۆشنایی و جیاكەرەوەی نێوان ڕەوایەتی و پوچەڵییە بەگوێرەی ڕێڕەوی ئەوان بێت (الله)ی بەرز و مەزن ئەوەی پێویستە لەسەر بەندەكان بڕوایان پێهەبێت دەربارەی ناو و سیفەتەكانی (الله)ی ڕوونكردنەوەی بۆ نەداون و بۆ ژیری و (عقل)یانی جێهێشتووە و سپاردوویەتی, ئەوەی

بيانەوێ بۆی جێگیر بکەن و ئەوەی نەشیانەوێ ڕەتیبکەنەوە, بەڕاستی پوچەڵییەکەی ئەوەش زۆر دیار و ئاشکرایە.

**ج-** ئەوەی ئەو ڕێڕەوە بۆی چووینە ئەوەی دەگەیەنێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ و چوار خەلیفە ڕاشیدەکەی و هاوەڵ و صەحابەکانی و پێشینانی ئوممەت و پێشەوایانیان لە دوو خاڵ و بار بەدەر نییە و نەبووینە:

**یەکەم:** (قاصر) بێتوانا و دەستەپاچە بووینە.

**دووەم:** (مقصر) کەمتەرخەم بووینە لە شارەزایی و ڕوونکردنەوەی ئەوەی پێویستە بۆ (اللّٰه)ی بەرز و مەزن لە سیفەتەکانیدا،....

جا یا دەگوترێ پێغەمبەری خوا ﷺ و چوار خەلیفە و صەحابییەکانی و پێشینانی ئوممەت و پێشەوایانی دەستەپاچە و بێتوانا بووینە (قاصر) بووینە لەبەر نەزانین و نەفامیان پێیەوە نەتوانینیان لە شارەزابوونیان پێیەوە.

یا کەمتەرخەم (مقصِّر) بووینە بۆ ڕوونکردنەوەیان بۆ ئوممەتی بڕواداران...

* هەردوو ئەوانە پوچەڵن و دروست نییە.

**د-** ئەوەی لێدەکەوێتەوە کە فەرموودەی (اللّٰه) و پێغەمبەرەکەی ﷺ سەرچاوە و بۆ گەڕاوە و (مرجع) نییە بۆ خەڵکی لەوەی بیروبڕوایانە دەربارەی خوای پەروەردگاریان شارەزاییان و زانینیان پێیەوە لە

گرنگترین ئەو پەیامانەیە كە شەریعەت و یاسایەكانی (اللہ)یە, كە بۆ گەڕاوە و (مرجع) و سەرچاوەی ئەو ژیری و (عقل)انەیە كە چەند ڕاوبۆچوونێكی دژ بە یەك و تێكەڵ جیاوازە و پێچەوانەكانیان, جا ئەگەر ڕێگای بەدرۆهێنانەوەیان دۆزیەوە یان لادان و گۆڕینەكەی دەكەن كە (تحريف)ە بە لێكدانەوە (تأويل) ناوی دەبەن ئەگەر نەیانتوانی بە درۆی بێننەوە ئەوە دەكەن.

**هـ-** هەر لەو ڕێڕەو و بۆچوونەش ئەوە پێویست دەبێ و دەخوازێ كە ڕێگادراو ودروست بێت ڕەتكردنەوە و (نفي)كردنی ئەوەی (اللہ) و پێغەمبەرەكەی ﷺ جێگیریان كردووە بۆ (اللہ)ی و دەگووترێ دەربارەی.

(اللە) فەرموویەتی: ﴿وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا﴾ **الفجر: ٢٢**

واتە: پەروەردگارت ئەی مُحَمَّد ﷺ هات و دێت لە ڕۆژی دواییدا..

نەهاتووە و نایەت؟!

دەربارەی فەرموودەی پێغەمبەریش ﷺ کە فەرموویەتی:

<**ینزل ربنا إلیٰ السماء الدنیا**>... [١]

واتە: <**پەروەردگارمان دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا**>...

دەگوترێ دانابەزێت, چونکە ئەوانە بەلایانەوە (**مجاز**[٢])ن مانای ڕاستی و حەقیقی نیین.

یان بۆ مانایەکی تری دوور کە بێژە و وشەکە وا بخوازێ.

---

(١): البخاري: ٦٣٢١, مسلم: ٧٥٨

(٢): (مجاز): لادانی مانا ڕواڵەتییەکەی (بێژە=لفظ)

ئەوە بەگوێرەی بۆچوونی ئەوانەی بڕوایان بە (مجاز)ی هەیە, كە ئەوە ڕای:

**پەكخەران (أهل التعطيل) سێ پۆل و بەشن:**

١- (غلاة الجهمية) زێدەڕەوانی جەهمییەكانن كە ناوە زۆر جوان و سیفەتە بەرز و تەواوەكانی (اللّٰه)یان تەواو ڕەتكردۆتەوە.

٢- هەندێكیشیان تەنیا سیفەتەكانیان جگە لە ناوەكانیان ڕەتكردۆتەوە.

٣- ئەوانەیتریش هەندێك لە سیفەتەكانیان ڕەتكردۆتەوە و ناو و سیفتەكانیتریان جێگیر كردووە.

* (جمهور) زۆرینەیە كە (مجاز) بوونی هەیە لە زمان و قورئان و فەرموودەش دەگونجێ بەڵام كۆمەڵێك لە زانایانی لێكۆڵەرەوەش كە

(**ابن تيمية**) و (**ابن القيم**)يش لەوانن (مجاز) لە زمان و قورئان و فەرموودە نييە و نابێ هەبێت...

لە كوردى بێژەى (مجاز) بە ماناى: (خوازتن, خوازە, باسكردنى شتێك بە پێچ و پەنا)يە.

وصلى الله وسلم وبارك على عبده ورسوله نبينا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين ، والحمدلله رب العالمين

**اللَّهُمّ أَرِنَا الْحَقّ حقاً وارْزُقْنَا اتِّبَاعُه وأَرِنَا الْبَاطِل باطلاً وَارْزُقْنَا اجْتنابه**

# پێڕست